# کۆمەڵی هەقە

## (لە شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەوە تا حەمەسووری کلاوقوت)

١٩٢٠ - ١٩٨٦

لێکۆڵینەوەی: ڕێبوار حەمە تۆفیق




ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد

# کۆمەڵی هەقە

(لە شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەوە تا حەمەسووری کلاوقوت)

١٩٢٠ — ١٩٨٦

لێکۆڵینەوەی: ڕێبوار حەمە تۆفیق

پرۆژەی: ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد



ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد

ناوی کتێب: کۆمەڵی هەقە- لە شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەوە تا حەمەسووری کلاوقوت

لێکۆڵینەوەی: ڕێبوار حەمە تۆفیق

ژمارەی بڵاوکراوە: ١٠٦ی ئینستیتیوت/ ئۆفیسی سلێمانی

دیزاینی بەرگ: شاروخ ئەرژەنگی

ڕێکخستنی لاپەڕەکان: مەهدی ئەحمەد

فۆتۆ: ڕێبوار حەمە تۆفیق

چاپخانە: شڤان - سلێمانی

تیراژ: ٥٠٠

چاپی یەکەم: ٢٠١٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٢٥٥)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێ دراوە



ناونیشان:

عێراق - سلێمانی - گەڕەکی ڕاپەڕین ١٠٢- شەقامی پیرەمەگروون ١١

Tel: 0044704-3137233

www.khi03.com
khi_2003@hotmail.com

**سوپاس و پێزانینم بۆ هەر یەك لە:**

١. (حەسەن عەبدولکەریم) کە لە خوێندنەوە و وەرگێرانی هەندێك لە دەستنووسە کۆنەکاندا هاوکاری کردم.

٢. کاك (سدیق سالەح) کە هەندێك بەڵگەنامەی ڕۆژنامەوانی دەگمەنی پێشکەش کردم.

٣. مامۆستا (عەتا محەممەد عەلائەدین) لە بەشی جوگرافیای زانکۆی سلێمانی، کە لە دیاریکردنی دابەشبوونی جوگرافیای هەقەکان لە سەر نەخشە، یارمەتی داوم.

٤. کاك (عەباس عەبدولرەزاق)ی ناسراو بە (عەباسی ڤیدیۆ) کە چەند چاوپێکەوتنێکی ڤیدیۆیی پێشکەش کردم.

دەزام بادیـــەی عیـــشقە خـــەطـــەرنـــاك
کەچی هەر چوم، ئەگـەر مام و ئەگـەر چوم

(مەحوی)

# پێرست

## بەشی دووەم



## بەشی سێیەم

## پێشەکی:

کۆمەڵی هەقەکان، خاوەنی سامانێکی دەوڵەمەندی هەمەلایەنەی فەرهەنگین. سامانی کەلەپووریی هەقەکان، زۆر ئاست و بواری جیاوازی گرتووەتەوە و هەرکەسێك شتێکی لە بارەوە نووسیبێتن، ئەو ڕاستییەی نەشاردووەتەوە کە ئەوەی نووسیویەتی، هەموو شتێك نییە و بابەتەکە لە ئەوە زۆرتر هەڵدەگرێت کە ئەم لە بارەیەوە نووسیویەتی. ئەوەی لە چوارچێوەی ئەم لێکۆڵینەوەیەشدا هاتووە، دیسانەوە ناکاتە تەواوی کۆکردنەوە و لێکدانەوەی ئەو کەلەپوورە مەزنە. بە ئومێدی ئەوەی لە داهاتوودا ئەم کەلەپوورە بکرێتە هەوێن و کەرەستەی دەیان لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنە، فیلم، چیرۆك، هۆنراوە، گۆرانیی و... هتد.

### ١- گرنگی هۆکاری هەڵبژاردنی بابەتەکە:

کوردستان لانەی چەندین ئایین و ئایینزا و تەریقەتی جیاوازە کە هەر یەکەیان، خاوەنی چەند تایبەتمەندییەکی تایبەتن و کەلەپوورێکی تایبەت بەخۆیان هەیە. هەقەکانیش لە ئەم لایەنەوە، کەلەپوورێکی دەوڵەمەندیان هەیە و ئەوە دەهێنێت کە وەك ڕاستییەکی مێژوویی، کۆبکرێتەوە و وەك نموونەی سەردەمانێك پیشان بدرێت کە کورد تێیدا توانیویەتی ئاراستەی گۆڕان و چەند نەریتێکی نوێ لە کۆمەڵگای کوردیدا بهێنێتە ئاراوە کە لە پێشدا نەبووە. ئەگەر لە ئێستادا هەوڵ بۆ کۆکردنەوە و تۆمارکردنی ئەو کەلەپوورە نەدرێت، ئەوا بێگومان پاش چەند ساڵێکی تر، ئەم کەلەپوورە کوێردەبێتەوە و ناتوانرێت ڕاستی ڕووداو و کەسایەتییەکانی، وەك خۆیان بناسرێنەوە.

## ٢- ئامانج و ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی:

کۆکردنـــەوەی زانیـــاریی و بەڵگەنامـــەکان لـــە لایـــەك و بـــەراوردپێکردن و لێکدانەوەی ئەو زانیاریانەشی کە تا ئێستا بەشێوەی جۆراوجۆر وتراو و نووسراون لە لایەکی ترەوە، ئامانجی لە پێشینەی بەردەم ئەم لێکۆڵینەوەیـەن. بۆ گەیشتن بـە ئـەم ئامانجـەش، کـەلك لـە ڕێبـازی لێکۆڵینـەوەی (مێـژوویی- کۆمەلایـەتی) وەرگیراوە کە پشت بە لایەنی کۆمەلایەتیی و ئاستی پەیوەندی نێوان ئەندامانی کۆمـەڵ دەبەستێت لـە چوارچێوەی ئـەو ماوەیـەدا کـە لـە ئـەم لێکۆڵینەوەیـەدا مەبەسـت لـە نێـوان سـالانی (١٩٢٠ – ١٩٨٦)ـە، بـەلام لەبـەر فـرە ڕەهەنـدیی بابەتەکە، گەورەیی ڕووداو و گرفتـە جیاوازەکـان و بەیەکداچوونی هەنـدێك بابـەت بەناو یەکتریدا، ناچار لەهەندێ شوێندا، لێکۆڵەر لە ئەم ڕێبازە لای داوە و کاری بە یەك ڕێبازی لێکۆڵینەوەی دیاریکراو نـەکردووە؟ چـونکە: گێڕانـەوەی ڕووداوەکـان، سـاغکردنەوەی ڕووداو و زانیـاری لـە سـەر کەسـەکان و بـەراوردپێکردنی سەرچاوەکان چۆنیان ویستبێت، بە ئەو شێوەیە، تۆمارکراون.

## ٣- پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە:

بەشێوەیەکی گشتیی، لێکۆڵینەوەکـە بـۆ سـاڵەکانی نێـوان (١٩٢٠-١٩٨٦) تەرخان کراوە، کە دەکاتە سەردەمی سەرهەڵدان و دەستپێکردنی ڕێبازەکە... تـا کۆچی دوایی حەمەسووری کلاوقوت. ڕووداو و باسـەکانی نـاو ئـەم مێـژووەش، لـە سێ بەشدا خراوەتە ڕوو، کە ئەمانەن:

**بەشی یەکەم:** ئەم بەشە دەروازەی چوونە ژوورەوەیە بۆ ناو بابەتەکـە و تێیـدا (سۆفیگەرێتی) وەك چەمك و زاراوە باس کراوە و بە تەریقـەتی نەقشبەندیی و بە

ڕێبازی هەقەوە بەستراوەتەوە. هەر لە ئەم بەشەدا، جگە لە بنەماڵەی دامەزرێنەر، پوختەی ناوی ڕێبازەکە و سنووری جوگرافیای هەقەنشین، خراونەتە ڕوو.

**بەشی دووەم:** لە ئەم بەشەدا، ژیان و هەندێك لە بەسەرهاتەکانی هەریەك لە: شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، مامەڕەزا و حەمەسووری کڵاوقوت خراونەتە ڕوو، کە زانیارییەکانمان زۆرتر لە سەر حەمەسووری کڵاوقوت چڕکردووەتەوە؟ چونکە جگە لە ئەوەی خاوەنی ڕێچکەیەکی تایبەتە، تا ئێستایش کەمترین نووسینی لە سەر نووسراوە.

**بەشی سێیەم:** قوڵایی لێکۆڵینەوەکە دەگرێتەوە و تێیدا: جیهانبینی بیری هەقە، پەیوەندی هەقە لەگەڵ هەریەك لە: ئەهلی هەق، بەهائییەکاندا خراوەتە ڕوو، هەروەها بەربەرەکانێکردنی هەقەکانیش هەر لە ئەم بەشەدا باس کراوە.

### ٤- شیکردنەوەی سەرچاوەکان:

سەرچاوەکان لە هەرسێ زمانی کوردی، عەرەبی و فارسییەوە وەرگیراون، کە مەرج نییە هەموو ئەم سەرچاوانە ڕاستەوخۆ باسیان لە کۆمەڵی هەقە کردبێت، بەڵکو هەندێکیان بەشێوەی ناڕاستەوخۆ باسیان لە ڕێبازەکە کردووە و زۆرتر لە بەشی یەکەمدا کەڵکیان لێ بینراوە. هەندێك لە سەرچاوەکان، جگە لە ئەوەی بەشێوەیەکی زانستی نەنووسراونەتەوە، هەست بە ئەوەش دەکرێت کە مەرامێك لە پشت نووسینیانەوە هەیە، بۆیە لەشوێنی بەکارهێنانی زانیارییەکانی ناو ئەم سەرچاوانەدا، لە پەراوێزدا هەڵەکان ڕاست کراونەتەوە و لەگەڵ سەرچاوەی تریشدا بەراورد پێ کراونەتەوە. بەشێکی تر لە سەرچاوەکان، زانیاری هەڵە و تێکەڵیان تێدابوو، کە لە ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، ساغکردنەوەیان بۆ کراوە و لەشوێنی وەرگرتنیاندا، سەرنج و تێبینییان لە سەر تۆمار کراوە.

## ٥- گرفتی بەردەم لێکۆڵینەوەکە:

نەبوونی ناوەندێکی تایبەتمەند بۆ کاری لێکۆڵینەوە لە کوردستاندا، وای کردووە ئەرکی لێکۆڵەر خۆبەخۆبێت و بەتەنها پشت بە توانای خۆی ببەستێت و هاوکاری هەمەلایەنەی لەبەردەستدا نەبێت! ئەمە لەکاتێکدا لای گەلانی تر، دەیان ناوەند و دەزگای لێکۆڵینەوە هەیە! ئەم گرفتە، یەکێکە لە ئەو هۆکارانەی کە وای کردووە تا ئێستا لە لای کورد، بواری لێکۆڵینەوەی بە هەژاریی بمێنێتەوە و لێکۆڵینەوەی کوردیی هەنگاوی لەبەرچاو نەنێت. لەئێرەدا جێی خۆیەتی سوپاسی بەشی لێکۆڵینەوەی (ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد) بکەم کاتێک بەرنامەی ئەم لێکۆڵینەوەیەم پێشکەش کردن، پەسەندیان کرد و لەماوەی ساڵ و نیوێکدا، کارەکە بە ئەنجام گەیەنرا. جگە لە ئەم خاڵە، چەند چەند گرفتێکی تریش لە بەردەم لێکۆڵینەوەکەدا هەبوون، وەك: کەمی سەرچاوە لە سەر بابەتەکە، لە ژیاندا نەمانی زۆربەی ئەو کەسانەی کە ڕاستەوخۆ لە ڕێبازەکە بەشداربوون. ئەوانەشی کە لە ژیاندا ماونەتەوە، یان تەمەنیان ڕێگەی ئەوەیان ناداتێ بیاندوێنین، یان بەهۆی باری شێواوی سیاسیی و ئابووری ساڵانی پێشووەوە، زێدی ڕەسەنی خۆیانیان بەجێ هێشتووە و بە ئاسانی نادۆزرێنەوە.

بەشێك لە هەقە کۆنەکان، ئەوانەی کە تەمەنیان هێندە بەرەو سەرەوە نەچووە، نەیاندەویست هیچ زانیارییەکمان بدەنێ یان قسەمان بۆ بکەن؟! ئەگەر هۆی ئەمە ئەوە بێت کە بەبڕوای زۆرێك لە باوەڕدارانی ڕێبازەکە یان ڕێچەکەکانی، درکاندنی زانیاری، کارێکی باش نییە و بیروباوەڕەکەیان ڕێگەیان نادات کە هیچ لەسەر خۆیان بۆ بێگانە باس بکەن، ئەوا بەشێکی تر لە ئەو کەسانەی داوامان لێ دەکردن بە ئەو زانیارییانەی کە لە لایانە هاوکاریمان بکەن، بیانووی ئەوەیان دەهێنایەوە کە خۆیان بەنیازن لە دەرفەتێکدا کارێکی لە ئەم شێوەیە بکەن؟!

یەکێکی تر لە گرفتەکانی بەردەم ئەم لێکۆڵینەوەیە، بریتییە لە هەڵە و نادروستی زۆرێك لە زانیارییەکانی ناو ئەو نووسراوانەی کە لە ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ئاماژەیان بۆ کراوە، کە بۆ ڕاستکردنەوە و ساغکردنەوەیان کاتێکی زۆر پێویست بوو. لە ڕووی ڕێنووسیشەوە، کارەکەمان گرفتی هاتە پێش و بەشێکی زۆری سەرچاوەکان پڕ ڕێنووسیان گەونجاو نەبوو، کە بەپێویست زانرا لەکاتی وەرگرتنیاندا، سەرلەنوێ چاك بکێن و بهێنرێنە سەر ئەو شێوە ڕێنووسەی کە ئێستا تارادەیەکی زۆر بە ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی دادەنرێت.

## ٦- تێبینیی و سەرنج:

١- بۆ جیاکردنەوەی پەراوێزی لێکۆڵەر لە پەراوێزی سەرچاوەکان، لە کۆتایی ئەو پەراوێزانەی کە لە سەرچاوەکانەوە وەرگیراون، ناوی خاوەنەکەی لە ناو دوو کەوانەی لە ئەم شێوەیە ()دا دانراونەتەوە.

٢- لە چوارچێوەی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، پێکهاتەی ناوی هەقە، بەچەند شێوەیەك هاتووە وەك (ڕێباز، تایفەی ئایینی، بزووتنەوە، ڕێچکە، تەریقەت، کۆمەڵ...) هیچ گومانیشی تێدا نییە کە هەریەکە لە ئەم چوارچێوانەش، پەیوەندی بە واقیعێکی ئایینی، کۆمەڵایەتیی و فەرهەنگییەوە هەیە کە ئەم ناوە لە ناو خۆیدا کۆی کردوونەتەوە. لە ئەم لێکۆڵینەوەیەشدا، بە کۆمەڵ یان ڕێباز ناوی براوە و لە ئەو شوێنانەشدا کە لە نووسینی ترەوە وەرگیراون، چۆن هاتووە، بەهەمان ناوەوە دانراونەتەوە.

٣- پاش کۆتایی هاتنی لێکۆڵینەوەکە، لێکۆڵەر بەپێویستی زانی، سەرنج و تێبینی چەند شارەزایەك لەسەر تێکڕای لێکۆڵینەوەکە وەربگرێت، بۆ ئەو مەبەستەش، هەریەك لە بەڕێزان (مستەفا عەسکەری، ڕەشید محەممەد عەلی)ی

دیاری کرد تا پێداچوونەوە بۆ لێکۆڵینەوەکە بکەن و ئەوانیش بەسوپاسەوە بەدەنگ داواکارییەکەوە هاتن و بە تێبینیی و سەرنجەکانیان، هێزێکی تریان بە ناوەڕۆکی ئەم بەرهەمە بەخشی. لەئێرەدا جێی خۆیەتی سوپاسێکی زۆر ئاراستەی مامۆستای مێژوونووس (د. کەمال مەزهەر) بکرێت کە سەرەڕای کاری زۆری خۆی، کاتێك لێکۆڵەر لێکۆڵینەوەکەی خستە بەردەست و داوای لێکرا کە سەرنجی خۆی لەسەر دەرببڕێت، لەخۆ بردووانە بەدەنگ داواکەوە هات و لەکۆتایدا، جگە لە پەسەندکردنی لێکۆڵینەوەکە، تۆمارێك لە بیرەوەری خۆی و کەسێکی سەر بە کۆمەڵی هەقەی پێشکەش بە لێکۆڵەری کرد[1]، دووبارە سوپاس بۆ هەموو ئەم بەڕێزانە.

**ڕێبوار حەمە تۆفیق**
rebwar_hamatofiq@yahoo.com

---

1- بڕوانە دەقی تۆمارەکە لە لاپەڕە ٢١٤دا.

### هەوڵە سەرەتاییەکانی کارکردن لە ئەم بابەتەدا:

ئەو هەوڵە سەرەتاییانەی کە تا ئێستا دراون، هەموویان جێگەی بایەخن و هەریەکەیان لە شوێنی خۆیانەوە، توانیویانە کەلێنێك پڕبکەنەوە. لە ئێرەدا جێگەی خۆیەتی کاروانی ئەم هەوڵانە، بەرز هەڵسەنگێنین و ئاماژەیان بۆ بکەین[1]، ئەمانەش ئەوە دەردەخەن کە یەکەمین کەسێك نووسینی لە سەر کۆمەڵی هەقەکان نووسیبێت، لە ناو بێگانەکاندا بریتییە لە (ئیدمۆنز) و لە ناو کوردیشدا (کەریم زەند)ە[2]:

١- ئەوەی لە ئەم پۆلێنکردنەدا جێی سەرنجە ئەوەیە: بەشی زۆرینەی ئەو بەرهەمانەی کە تا ئێستا لە سەر ئەم بابەتە نووسراون و لەبەردەستدان، مێژووی تۆمارکردنیان دەکەونە پێش ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ی گەلی کوردستانەوە، ئەمە لەکاتێکدا کە زەمینەی توێژینەوە و بە دواداچوونی لەبار، زۆرتر دەکەوێتە دوای ئەم مێژووەوە و دەبوو زۆرتر و باشتری لە سەر بنووسرایە؟!

٢ – لە ئەم بارەیەوە، مامۆستا محەممەد مەلا کەریم دەنووسێت (ئەوەندەی من پێی بزانم تائێستا "مەبەستی تا ساڵی ١٩٨٢ یە– لێکۆڵەر" لە وتارێکی کاك حەسەن عەوڵانی بەولاوە... هیچ بابەتێکی تر لەبارەی بزووتنەوەی هەقەوە بڵاو نەکراوەتەوە.) بڕوانە کتێبی (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل١١.) بەلام ڕاستییەکەی ئەوەیە مامۆستا (کەریم زەند) وەك کوردێك یەکەمین نووسەری کوردە کە لە سەر ئەم بابەتە نووسینی هەبێت، بڕوانە کتێبی (ئاین و باوەڕ لە کوردستاندا، کەریم زەند، سلێمانی، ١٩٧١.)

**یەکەم: ئەوانەی لابەلا باسیان لێوەکردووە:**

١- لە چوارچێوەی دانیشتن و کۆڕی پرسیار و وەڵامدا:

أ/ (مستەفا عەسکەری) ((کاتێك لە ساڵی ١٩٦٣ لە نوگرەسەلمان لە زینداندا بووە و لە چوارچێوەی ئەو ئازادییەی کە لە ئەو کاتانەدا بۆ زیندانییەکان ڕەخساوە، لە ئەم بارەیەوە، قسەی بۆ زیندانییەکان کردووە.))[1]

ب/ (مەلا سەلامی کوڕی مەلا مستەفای تریخۆر) ((کاتێك خوالێخۆشبوو دکتۆر "عەبدولستار تاهیر شەریف" لە ساڵی ١٩٧٩ دا چاوپێکەوتنێکی لە سەر ئەم بابەتە لەگەڵدا کردووە و لە سەر کاسێت تۆمارکراوە.))[2]

٢- لە چوارچێوەی یاداشت و گێڕانەوەدا:

أ/ (سی. جی. ئیدمۆنز) لە کتێبی (کرد ترك عرب، ترجمة: جرجیس فتح الله، مطبعة التایمس، بغداد، ١٩٧١.)

ب/ (هێنی هارۆلد هانسن) لە کتێبی (ژیانی ئافرەتی کورد، وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ کوردی: عەزیز گەردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٢.)

پ/ (جەمال بابان) لە (ڕۆژنامەی عێراق، ژمارە ٢٢٣٤، ساڵی ٥/١٠/ ١٩٨٢.)

ت/ (شاکر فتاح) لە (کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ، ژمارە٧ی ساڵی ١٩٤٦، هەروەها لە: ئاوێنەی ژینم، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٠٥، ساڵی ١٩٨٥.)

---

١- ئاوردانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، مستەفا عەسکەری، چ٢، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٨.

٢- بەشێکی زۆری ئەو پەراوێزانەی کە بۆ کتێبی (ئاوردانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە) لەلایەن محەممەد مەلا کەریمەوە نووسراون، لە ئەم چاوپێکەوتنەوە وەرگیراون. لێکۆڵەر هەوڵێکی زۆریدا تا جارێکی تر ئەو کاسێتەی دەست بکەوێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش پەیوەندی بە کەسوکاری خوالێخۆشبوو (عەبدولستار)ەوە کرد، بەڵام بەداخەوە لە بەردەستدا نەمابوو!؟

**دووەم: ئەوانەی وتاری سەربەخۆیان لە سەر نووسیوە:**

أ/ (هەمزە عەبدوڵڵا) (لە ناو ڕێکخراوەکانی پارتیدا، بەڕۆنیۆ بڵاوکراوەتەوە.)[1]

ب/ (حەسەن عەوالا ی) لە ((بڵاوکراوەی ڕەنجی کرێکار، ژمارە ٦، ساڵی ١٩٨٠، وتاری "تیشکێك بۆ نووسینەکەی محەمەد مەلا کەریم".))

پ/ (ڕەشید محمد علی) لە (مەسەلەیەکی مەزن و هەوڵێکی کەم، گۆڤاری کاروان، ژمارە ١٥، ساڵی ١٩٨٣.)

ت/ (کەریم زەند) لە کتێبی (ئاین و باوەڕ لە کوردستاندا، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٧١.)

**سێیەم: ئەوانەی کتێبی سەبەخۆیان لەبارەوە نووسیوە:**

١- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، مستەفا عەسکەری، چاپخانەی "علاء" بەغداد ١٩٨٣.

٢- بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە، رؤوف محمد زهدی، چاپخانەی الحوادث، بەغداد، ١٩٨٥.

---

١- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پەراوێزی ژمارە ١، ل١٢.

# بەشی یەکەم

## باسی یەکەم

١- سۆفیگەری

٢- سۆفیگەری لە کوردستاندا

٣- کورتەیەك لە مێژووی تەریقەتی نەقشبەندیی و بڵاوبوونەوەی لە باشووری کوردستاندا

٤- کورتەیەك لە ژیانی مەولانا خالیدی نەقشبەندیی

٥- ململانێی نێوان ڕێبازی قادریی و نەقشبەندیی

٦- زنجیرەی تەریقەت پێدان و ئیرشادکردن

## ١- سۆفیگەری:

سەبارەت بە سەرەتای دەرکەوتنی سۆفیگەریی و پەیوەندی بە باوەڕە ئایینییەکانەوە، بیروبۆچوونی جیاواز لە ئارادایە. ((هەندێك لە نووسەرانی سۆفیگەری- بەتایبەتی خۆرهەڵاتناسەکان- لە ئەو باوەڕەدان کە سۆفیگەری لە بنچینەوە لە گیانی ئیسلام دوورە، هەندێکی تریش دەڵێن: بۆ ئەو کاتانە دەگەڕێتەوە کە موسوڵمانەکان ئێرانیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و لە ڕووی سەربازییەوە فارسەکان شکاون... ڕایەکی تریش هەیە کەپێی وایە ڕەبەنایەتی مەسیحی، کارێکی زۆری لە سەر سۆفیگەری ئیسلامی داناوە.))[1] هەروەها بەپێی بۆچوونێکی تر، سۆفیگەری ڕیشەیەکی پێشینەتری هەیە و بۆ پێش هاتنی ئایینی ئیسلام دەگەڕێتەوە، چونکە ئەم بۆچوونە پێی وایە ((سۆفیگەری ئیسلامی، لە بنەمایەکی مەجووسییەوە وەرگیراوە؟ بە بەڵگەی ئەوەی کە زۆر لە مەجووسییەکان لە سەرووی ئێران، دوای هاتنی موسوڵمانەکان بۆ ئێران، هەر لە سەر ئایینی خۆیان مانەوە.))[2] ئەوەی کە تێکڕای ئەم بۆچوونانە پشتڕاست دەکاتەوە و بەرگرییان لێ دەکات، بریتییە لە ئەو ڕاستییەی کە ((سۆفیگەری، پێش هاتنی ئایینی ئیسلام، لە ناو ئایینی جولەکە و مەسیحییدا هەبووە و زۆربەی

---

١- سۆفیگەری، د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، چ١، دەزگای موکریان، هەولێر، ٢٠٠١، ل٢٠. کە ئەویش لە ((في التصوف الاسلامي، المقدمة، نیکولسون، ترجمة: ابوالعلا العفیفي، القاهرة، ١٩٦٩، ص ج- د/ تاریخ تصوف در اسلام، د. قاسم غني، انتشارات زوار، چاپ گلشن، تهران، ١٣٦٩، ه ش، ص٤/ نشأة الفلسفة الصوفیة و تطورها، د. عرفان عبدالحمید، بیروت، ١٩٧٤، ص٥.))ی وەرگرتووە.

٢- هەمان سەرچاوە...، کە ئەویش لە ((في التصوف الاسلامي، المقدمة، نیکولسون، ترجمة: ابوالعلا العفیفي، القاهرة، ١٩٦٩، ص ج- د/ تاریخ تصوف در اسلام، د. قاسم غني، انتشارات زوار، چاپ گلشن، تهران، ١٣٦٩، ه ش، ص٣/ تاریخ التصوف الاسلامي، د. عبدالرحمن بدوي، ط٢، وكالة المطبوعات، الكویت، ١٩٧٨، ص٣١.))ی وەرگرتووە.

بیروڕاکان لە سەر ئەوەن کە لە ڕێگەی فارسەکانەوە، لە وڵاتی هندستانەوە گەیشتووەتە دوورگەی عەرەبی.))[1]

سەبارەت بە پەیوەندی سۆفیگەریی و ئاین بەیەکەوە، زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان، ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕەوتی پەرەسەندووی سۆفیگەری، لە هەناوی ئایینەوە لە دایك بووە و ئایینی ئیسلامیش وەك یەکێك لە ئەو ئایینانە، جگە لە ئەوەی بەهەمان شێوەی ئایینەکانی پێش خۆی، ئەم پەیوەندییەی پاراستووە، لە هەمان کاتیشدا ڕەوتی سۆفیگەری لە ئەم ئایینەدا گەشەسەندنێکی زۆرتری بەخۆیەوە بینیوە و ((تەسەوفی ئیسلامی، شان بەشانی پەیامی ئیسلام بە گشتی، ئەو جوگرافیا فراوانەی گرتووەتەوە کە ڕووبەری ژێر سایەی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی ئیسلام بووە و لە هەندێ جێگای ئەو جوگرافیایەدا، بە جۆرێك پەرەی سەندووە کە بابەتی تەسەوف بووەتە بابەتی یەکەم و ئیسلام و ئیسلامەتی، دوور لە تەسەوف باس نەکراوە.))[2]

سەبارەت بە سەرچاوە و بنەڕەتەکانی سۆفیگەری ئیسلامی، چەند بیروبۆچوونێکی جیاواز هەیە. هەندێك پێیان وایە کە قورئان و فەرموودە، دوو سەرچاوەی سەرەکی تەسەوفی ئیسلامین و هەندێکی تر بە پێچەوانەوە، پێیان وایە: سۆفیگەری ئیسلامی لەگەڵ بنەڕەتەکانی قورئان و فەرموودەدا تەبانییە و یەکێك لە ئەو بنەڕەتانەی کە سۆفیگەری پێدەناسرێتەوە، بریتییە لە ناتەبایی بوونی تێڕوانینی سۆفی لەگەڵ ئەو تێڕوانینەی کە شەرع بۆ جێبەجێکردن و ڕووتێکردنیان دای ناوە. جا لەبەر ئەوەی کە ((بیر و هزر، فەلسەفە و هێڵی

---

١- بڕوانە: تاريخ الفلسفة في الاسلام، دي بور، ترجمة: محمد عبدالهادي ابو زيدة، ط٥، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨١، ص١٦.

٢- سلێمانی زەمینەی پەرەسەندن و ململانێی تەسەوف، عەتا قەرەداغی، زنجیرەی بڵاوکراوەکانی هەفتەنامەی سلێمانی نوێ، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٩.

سۆفیگەری ئیسلامی، دژی سێ دەسەڵاتی سەرەکییە کە بریتین لە: دەسەڵاتی دەوڵەت، دەسەڵاتی ئایینی و دەسەڵاتی دارایی.))[1]، شتێکی ئاساییە کە ناکۆکی لە سەر سەرچاوەی سەر/کی بیری سۆفیگەری و ئەو ناتەباییەدا هەبێت کە لە نێوان شەریعەت و تەسەوفدا هەیە، بەتایبەت کاتێک کە ((لە سۆفیزمدا، حەقیقەت دیاردەیەکی لۆژیکی نییە و نەقلکردنی شەرعیش نییە. دۆزینەوەی حەقیقەت، لە دەرەوەی هەست و ئەقڵ و شەریعەتەوەیە، ئەویش لە ڕێگەی دڵەوەیە کە تاکە هۆکارە سۆفی بەهۆیەوە بە خوا دەگات و هەست بە نهێنیی، گەورەیی و پایەداری ماهییەتی نادیاری دەکات، ئەمەش دوا ئامانجە لە تەسەوفدا؟ چونکە تەسەوف کارێکی تایبەتمەند و تاکڕەوانەی مرۆڤە کە تیایدا "نەفس" مەبەستە و دەبێت بە دوا پلەی خاوێن بوونەوە بگات و لەگەڵ نەفسی کەینونەی نادیاردا تێکەڵاو بێت.))[2] هەر لە ئەم بارەیەوە هەندێك پێیان وایە ((ناڕەوایە تاکە سەرچاوەیەك بۆ سۆفیگەری ئیسلامی دیاری بکرێت، بەڵکو بەگشتی سۆفیگەری ئیسلامی، لە ناو ئەو بیروباوەڕە جیاوازانەوە هەڵقوڵاوە کە تێکەڵاوی موسوڵمانەکان بووە، واتە: هەرمیللەتێك کە بووەتە موسوڵمان، هەندێك لە بیروباوەڕی کۆنی خۆی هێشتووەتەوە و کردویەتییە هەوێنی سۆفیگەری ئیسلامی.))[3]

ئەگەرچی بڵاوبوونەوەی سۆفیگەری لە ناو کورددا، شانبەشانی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام نەبووە، بەڵام بەشێوەی جیاجیا خۆی دەرخستووە، ئەویش کاتێك کە یەکەمین تەریقەتی سۆفیگەری ((لە سەدەی چوارەمی کۆچییەوە و لە

---

١- سۆفی و سۆفی گەرێتی، لەتیف هەڵمەت، بڵاوکراوەی پاشکۆی ڕەخنەی چاودێر، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل١١.

٢- سلێمانی زەمینەی پەرەسەندن، سەرچاوەی پێشوو...، ل١١.

٣- سۆفیگەری، سەرچاوەی پێشوو...، کە ئەویش لە (في التصوف الاسلامي، المقدمة، نيكولسون، ترجمة: ابوالعلا العفيفي، القاهرة، ١٩٦٩، ص س-ع)ی وەرگرتووە.

ڕێگای"محەممەد نور بەخشی"یەوە هاتە کوردستان کە بە تەریقەتی"نوربەخشی" ناسرا و پاش ئەم، تەریقەتی "عەلەوییەکان" دێت کە بە لقێك لە تەریقەی "خەڵوەتی"ناسراوە و سەید"محەممەد بابە ڕەسوڵ" هێناویەتییە کوردستانەوە... لە دواتریشدا، هەریەك لە تەریقەتەکانی قادریی و تەریقەتی نەقشبەندیی هاتنە کوردستانەوە و پەرەیان سەند و زۆر بە بەربلاوی لە ناو کورددا پەخش بوونەوە.))[1]

## وەك زاراوە:

سەبارەت بە وشەی سۆفی، بۆچوونی جیاواز و جۆراوجۆر هەیە. هەندێك پێیان وایە کە لە وشەی (("صفاء"ەوە هاتووە و بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەیە کە دەفەرموێت **"ذهب صفو الدنيا ويبقى الكدر"**. بەپێی بۆچوونێکی تر وشەکە دەچێتەوە سەر ناوی "صفة"ی مزگەوتی پێغەمبەر. بۆچوونێکی تر پێی وایە لە "صف"ـەوە دارێژراوە کە بەمانای ڕیزی پێشەوەی ئەو کەسانە دێت کە بۆ خواپەرستی لە ڕیزی پێشەوەن.))[2] بۆچوونێکی تریش پێی وایە لە وشەی (("سۆفیا"ی یۆنانییەوە هاتووە کە بە مانای زانین دێت.))[3] ئەوەش بلاوە کە هەریەکە لە پیتەکانی وشەکە، دەچێتەوە سەر وشەیەك: پیتی "ت" بۆ تەوبە، "س" بۆ سەفائی ڕۆح، "و" بۆ ولایەت و "ف" بۆ فەنابوون، بەڵام ئەو بۆچوونەیان لە هەموویان پەسەندترە کە پێی وایە ((وشەی "سۆفی" لە

---

١- تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ ئەحمەدی سەرداری سەرگەڵوییەوە بەرەو حەقە، عارف ئەیفوور، گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٦٩، ساڵی ٢٠٠٢، ل٢١٣.

٢- الرسالة القشيرية، عبدالكريم القشيري، دار التربية للطباعة والنشر والتوزيع، بغداد، ص٢١٦- ٢١٧.

٣- www. Burhaniya.org

"صوفه"وه هاتووه– كه ماناى تيسكه خوريى دەگەيەنێت[1]... ئەمەش نەك هەر لە لايەنى زمانەوانييەوە ڕێی تێدەچێت، بەڵكو لايەنە واتاييەكەشى فەرامۆش نەكردووە، چونكە سۆفييەكان لە خودى خۆيانەوە، حەزيان لە بێ فيزيى و گۆشەنشينيى و خۆشكاندنەوەيە و دوور نييە لە بێ نازيدا خۆيان كردبێتە هاوشانى "صوفە"))[2] كەواتە: لە ڕووى زمانەوانيى و زاراوەوە، زۆر نزيكە كە ((بەهۆى لەبەركردنى بەرگى خورييەوە ناويان بە سۆفى هاتبێت؟ چونكە لەبەركردنى جلوبەرگى خورى، جگە لە ئەوەى ڕەوشتى پێغەمبەرەكان و دروشمى وەليى و پياوچاكان بووە.))[3] هۆكارێكيش بووە بۆ ئەوەى سۆفى هەميشە هەست

---

١– لە ناو زۆرينەى ئايين و ئايينزا و باوەڕەكاندا، شێوە و جۆرێك لە بەرگپۆشين هەيە كە وەك هێمايەك بۆ هۆگريى تەواوەتيى و نزيكايەتييەكى بە هێز لە ئەو ئايين و باوەڕە لەبەر دەكرێت و كۆمەڵێك كەس، جيا لە نەريتى پۆشينى باوى كەسەكان، بەرگێكى تر دەپۆشن، هەروەك چۆن لە چەمكى (تەسەوف)دا ئاماژەى پێدرا. لە ناو ئێزدييەكانيشدا، (خرقەپۆش) هەيە كە وەك نەريتێكى ئايينيى كۆمەڵايەتى وەهايە و لەلايەن عەشيرەتەكانى فەقيرى ئێزديدا (حمۆ، جندق، زەرۆ، بەكێ، بۆقەئار)دا كاتێك پياوێك تەمەنى دەگاتە سەروو چل ساڵان، لە ڕێوڕەسمێكدا خرقەى لەبەردەكەن، كە جۆرە بەرگێكى لە خوريى دروست كراوە، لە ئەو ساتەوە ئيدى ئەم كەسە وەك كەسايەتييەكى بەهادارى ئايينيى و كۆمەڵايەتى لێى دەڕوانن. خۆ گەر هەر كەسێك لە عەشيرەتى فەقير بمرێت، پارچەيەك لە ئەم خورييە، لەگەڵ تەرمەكەيدا دەنێنە چاڵەوە. (ئەم زانيارييەم لە "خەيرى حسن" كە بە "خەيرى شنگالى" ناسراوە، وەرگرتووە. ناوبراو خۆى ئێزدييە و ڕۆشنبيرييەكى باشى لەسەر ئەدەبيات و فۆلكلۆرى ئێزدييەكانيش هەيە.) هەروەها لاى كاكەييەكانيش لە كۆندا (شاڵپۆش) هەبووە، كە گەر باوەڕدارێكى كاكەيى ئەم پۆشاكەى بپۆشيايە، دەبوو ئيتر خۆى لە كارى سێكسى بگرتايەتەوە و تەنانەت لەگەڵ خێزانەكەشيدا جووت نەبێت. (ئەم زانيارييەم لە نووسەرێكى كاكەيى وەرگرت كە نەيويست ناوەكەى تۆماربكەم.)

٢– عوارف المعارف، ملحق احياء علوم الدين، ج٥، السهروردي، ص٦٥.

٣– مباني عرفان اسلامي، سيد محمد تقي مدرسي، ترجمة: محمد جعفر صديقي، چاپخانه امير، قم، ١٣٦٩، ص١٣٥.

بە نارەحەتیی بکات و لە خواپەرستی بە ئاگابێتەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هاتنی ئەهلی تەسەوفیش بۆ ناوی ئەو کەسانە دەگەڕێتەوە کە ((بەرگی زبری خوریبیان لەبەرکردووە کە بە عەرەبی پێی دەڵێن "صوف" و نیسبەت بۆ لای "صوف" دەبێت بە "صوفی" و بە کۆمەڵەکەش دەوترێت "صوفیة" یان "اهلی تصوف". حەسەنی بەصری فەرمویەتی "**لقد أدركت سبعين بدريا كان لباسهم الصوف**" واتە: حەفتا کەسم لە ئەسحابەی غەزای بەدر بینیوە کە هەموو بەرگی خوریبیان لە بەردا بووە. بۆیە خوریبیشیان لەبەرکردووە چونکە گوێیان بەدنیا نەداوە و خەریکی عیبادەت و تاعەت بوون و لە سووچی مزگەوتەکاندا کۆبوونەتەوە.))[1]

## وەك چەمك:

هەر لە ساڵانی (٢٠٠ك)ـەوە تا ئێستا، ژمارەیەکی زۆر پێناسە بۆ چەمکی (سۆفیی و سۆفیزم) کراوە، کە کۆمەڵێك پێناسەیان وەك نموونە، دەهێنینەوە:

(ئەبوبەکری کتتانی)[2] وەك (ئاکار) سەیری سۆفیگەری دەکات و دەڵێت ((سۆفیگەریی هەمووی ئاکارە، ئەوەی ئاکاری زۆرتر بێت، سۆفیگەرییەکەی زۆرترە.))[3] (سەهل کوڕی عەبدوللای توستوری)[4] لە لایەنی خۆشیی و ماڵی

---

١- یادی مەردان، بەرگی یەکەم، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٩، ل١٣٤.

٢- ئەبوبەکری کتتانی: لە بەغداد لە دایك بووە و هاوڕێی جونەیدی بەغدادی بووە، لە شاری مەکە ژیاوە و تا کۆچی دوایی لە (٣٢٢ك) لە ئەوێ ماوەتەوە. (الرسالة القشیریة، سەرچاوەی پێشوو...، ص٤٥.)

٣- تذكرة الأولياء، فريدالدين العطار، باهتمام علي بهائي شرفعلي، بومباي، ص٢٠٥.

٤- سەهل کوڕی عەبدوللای توستوری (٢٧٣- ٢٨٣ ك) (الرسالة القشیریة، سەرچاوەی پێشوو...، ص٢٤.)

دونیابییەوە مانای دەداتێ و دەڵێت ((سۆفی، چاوی لە سەروەت و سامان نەبڕیوە و هەمووی لە پێناو خوادا بەخت دەکات.))[1]، بەڵام (جونەیدی بەغدادی)[2] بابەتەکە لە ئەوە گەورەتر دەبینێت کە بتوانین لە هەموو لایەنەکانی بکۆڵینەوە و دەڵێت ((لایەنی ڕواڵەتی سۆفیگەری بگرە و پرسیار لە بنەڕەت و ڕاستییەکەی مەکە؟ چونکە ئەگەر پرسیاری لێ بکەیت، ئەوا ستەمی لێ دەکەیت، واتە: مافی خۆی نادەیتێ و وتەی ناڕەوات لێ دەبیسترێت.))[3]

دۆزینەوەی مانای تەسەوف و سۆفیگەری، لە ئاستێکی وەهادا نییە کە هەمووان بتوانین لێی تێ بگەین. ئەوەی کە زۆرتر تێگەیشتنەکەشی گران کردووە، ئەو دژایەتیی و هاوچوونییەیە کە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا هەیەتی. بەکورتی دەتوانین سۆفییەکان بکەین بە سێ گروپەوە:

یەکەم: ئەوانەی زۆرتر گرنگی بە لایەنی زانستی دەدەن و لە ئارەزووەکان دوور دەکەونەوە.

دووەم: ئەوانەی زۆرتر گرنگی بە لایەنی ڕەوشتی دەدەن.

سێیەم: ئەوانەی کە زۆرتر گرنگی بە مەعریفەی ئیلاهی دەدەن.

ئەگەر سەرنج لە زۆربەی پێناسەکان بدەین، تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەو پێناسانەی بۆ سۆفیگەریی کراون، لە ڕوانگەی جیاوازەوە خراونەتە ڕوو، بۆ نموونە ئەو پێناسانەی کە بەرەو (ئاکار) دەڕۆن، لە ئەو پێناسانەی کە بەرەو

---

١- الرسالة القشيرية، سەرچاوەی پێشوو...، ص٢١٨.

٢- جونەیدی بەغدادی: ناوی (جنيد بن محمد)ە، لە بنەچەدا، خەڵکی نەهاوەندە. لە بەغداد لە دایک بووە و لە ساڵی (٢٩٧ك)دا، کۆچی دوایی کردووە. (الرسالة القشيرية، سەرچاوەی پێشوو...، ص٣١.)

٣- تذكرة الأولياء، سەرچاوەی پێشوو...، ص٢٢٩.

حاڵ، یەکێتی بوون، پەند و ئامۆژگاریی، خۆشەویستی دەڕۆن، جیاوازن و دیاریکردنی هەریەکەشیان، جێگەی چەندین لێکدانەوە و بەدواداچوونە کە لە ئێرەدا جێگەی باسکردنیان نییە.

((سۆفیگەریتی: ناوێکە بۆ ئەو رێگەو ڕێبازانە بەکاردێت کە مرۆڤ بە پەروەردگار دەگەیەنێت و سۆفیی و سۆفیگەران دەیگرنە بەر. سۆفیگەریتی، گوزارشت لە لایەنی تیۆریی ڕێگەی هەقیقەت دەکات.))[1] و ئەو کەسەشی کە پیادەکەری ئەم ڕێگایەیە، پێی دەوترێت: سۆفی کە بەمانای "پیاوی هەق" دێت. ((سۆفی کەسێکە هیچ بانگەشە و پروپاگەندەیەکی بۆ نییە و خوای بەرز و بالا هەڵی بۆ خۆی بژاردووە و لە هەموو خەوش و پیسییەکی دەروون پاکی کردووەتەوە.))[2] سۆفیش ((ئەو ڕێبوارەیە کە ڕێگەی هەقی گرتووەتەبەر و لە رووی دڵ و دەروون و جیهانی ناوەکییەوە، بە ئاست و پلەی پاک و بێگەردی گەیشتووە.))[3]

لە ئەنجامدا بە پێناسەیەکی تەسەوف کۆتایی دەهێنین کە تارەدەیەکی زۆر کۆی پێناسەکانی پێشەوەی تێدا کۆبووەتەوە، کە بریتییە لە ئەوەی ((بەکەسێك دەڵێن کە لە ڕێڕەوی تایبەتی تەسەوفەوە تێدەکۆشێت، پلە بە پلە باوەڕی زۆربێت و لە خوا نزیك بێتەوە، تا دەگاتە دوا پلەی باوەڕ و لە ئەم پلەیەدا دڵی ئۆقرە دەگرێت.))[4]

---

١- التلال الزمردية نحو حياة القلب والروح، محمد فتح الله گولن، المترجم: احسان قاسم الصالحي، دار النيل للطباعة والنشر، الطبعة الأولى، ٢٠٠٥، ص١٢.

٢- هەمان سەرچاوە، ص٢٧.

٣- هەمان سەرچاوە، ص٢٧.

٤- تەسەوف چییە، ئەمین شێخ علاءدین نەقشبەندی، چ١، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٥، ل٦٥.

## ٢- سۆفیگەری لە کوردستاندا:

((کوردستان بەگشتیی و بەشەکەی سەر بە ئێراق بە تایبەتی، هەر لە ئەو ڕۆژەوەی کە ئیسلامەتی تێدا بڵاوبووەتەوە، دانیشتوانەکەی زۆر بە دڵسۆزییەوە ئایینەکەیان وەرگرتووە و خستویانەتە ناخیانەوە، بۆیە لە هەموو بوارێکی ڕۆشنبیریدا، شانبەشانی عەرەب، فارس، تورك و نەتەوە موسوڵمانەکانی تر، ڕۆیشتوون و بەئەندازەی توانای خۆیان، ڕۆڵیان لە ئەم بوارەدا، دیار بووە. هەر کە سۆفیگەری لە ناو موسوڵمانەکاندا چەکەرەی دەرکرد و بەرەبەرە ڕەگی داکوتاو بووە بیرۆکەیەکی خاوەن پرۆگرام و یاسای تایبەتی لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، بەتایبەتی لە ئێران و ئێراقدا، قوتابخانە سۆفیگەرییەکان پەیدابوون و سۆفییە مەزنەکانی کۆن لە ئەم قوتابخانانەدا سەریان هەڵدا و بیروباوەڕەکانیان بەهەر چوارلادا بڵاوکرایەوە... کوردستانی ئێراق، لە پێڕەوکردنی سۆفیگەریدا، شوێن پێی قوتابخانە سۆفیگەرییەکانی بەغدا و ئێران کەوت.))[1] و گەلێك ناوداری لە ئەم لایەنەدا پێگەیاند، کە تا ئەمڕۆش ناویان بەسەر زارەوەیە و هەریەکەیان شایەنی ئەوەن لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنەیان لە سەر بکرێت.

((سۆفیزم لە کوردستاندا، یەکێکە لە ئەو دیاردە ڕۆحییانەی کە جگە لە ئەوەی ڕانتاییەکی فراوانی لە کۆهەستی کۆمەڵایەتی"الشعور الجماعي الاجتماعي"ی خەڵکی کورددا داگیر کردووە، کاریگەری زۆریشی بەهەردوو دیوی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤدا بەسەر کۆکردنەوە و ئامادەکردنی هێزی جەماوەرییەوە لە ناو جوڵانەوە سیاسییەکانی کورددا هەبووە، زۆرجاریش ڕێبەرانی ڕۆحانی و شێخەکانی ڕێبازەکانی تەریقەت بوون بە ڕێبەری بزووتنەوەی ڕزگاریی نیشتیمانی

---

١- سۆفیگەری، سەرچاوەی پێشوو...، ل٦٩- ٧٠.

گەلی کورد، هەندێك جاریش بوونەتە بەشێك لە سیاسەت و هێزی سەربازی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان.))[1]

بەکورتی، دەتوانین تەریقەتەکانی سۆفیگەری لە ناو کورددا، بۆ ئەم بەشانە دابەش بکەین ((یەکەم: تەریقەتەکانی کوردی شیعە کە "نیعمەت ئیللاهی" و "خاکساری" دەگرێتەوە. دووەم: تەریقەتەکانی کوردی سوننە کە "قادریی" و "نەقشبەندیی" دەگرێتەوە.))[2]

---

١- لەبارەی ڕێبازەکانی سۆفیزم لەکوردستاندا، د. جەعفەر عەلی، گۆڤاری کوردۆلۆجی، ژمارە ١، ساڵی ٢٠٠٨، ل٩٢.

٢- بڕوانە: سۆفیگەری، سەرچاوەی پێشوو...، ل٧١- ٧٢.

## ٣- کورتەیەك لە مێژووی تەریقەتی نەقشبەندیی و بڵاوبوونەوەی لە باشووری کوردستاندا:

((ئەگەرچی ناوی نەقشبەندیی وەك ناوی تەریقەتێکی دیاری تەسەوف زۆر کۆن نییە، بەڵام مێژووی پەیدابوونی لە ئەمە کۆنترە و لە هەر قۆناغ و سەردەمێکدا، ناوێکی تایبەتی هەبووە. سەرهەڵدان یان دەرکەوتنی ئەم تەریقەتە، بۆ سەردەمی خەلیفەی ڕاشیدین دەگەڕێتەوە، واتە: بۆ سەردەمی ئەبوبەکری سدیق و لە ئەو قۆناغەشەوە تا سەردەمی بایەزیدی بەستامی، بە تەریقەتی سەدیقی ناسراوە، لە سەردەمی بایەزیدی بەستامیشەوە تا سەردەمی عەبدولخالقی غەجدەوانی، بەتەریقەتی تەیفوری ناوبراوە، لە دوای ئەمیشەوە تا سەردەمی شێخ محەممەدی بوخاری، بەتەریقەتی خواجەگان ناوبراوە، وەك ئاشکرایە شێخ محەممەدی بوخاری، بەشاهی نەقشبەند بەناوبانگە، واتە: لە ئێرەوە ئیتر ناوی نەقشبەندیی بووەتە ناوی ئەم تەریقەتە.))[1] ((تەریقەتی نەقشبەندیی هەرچەندە لە زەمانی کۆندا بووە و لە کوردستانیشدا نیشانەی هەبووە، بەڵام لە ئەو سەردەمانەدا وەك تەریقەتێکی ناسراو نەبووە و لە ناو خەڵکیدا ناوبانگی نەبووە.))[2] تا سەردەمی دەرکەوتنی مەولانا خالیدی نەقشبەندیی و گەڕانەوەی پاشساڵێك لە دیهلیی هیندستان و مانەوەی لەگەڵ شێخ عەبدوڵڵای دیهلەویدا و وەرگرتنی فەرمانی ئەم شێخە، کە دواتر بڕیار دەدات بگەڕێتەوە کوردستان و بەپێی ئەم فەرمانە، لە ناوچەکانی سەر بە دەسەڵاتی عوسمانیدا، بانگهێشتی بۆ ڕێبازی نەقشبەندیی بکات.

---

١- سلێمانی زەمینەی پەرەسەندن و، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٢.

٢- یادی مەردان، سەرچاوەی پێشوو...، ل٤٤.

((ساڵانی ١٨١١–١٨٢٠ بە پڕ بەرهەمترین ڕۆژانی ئەم ڕێبازە لە کوردستاندا دەژمێردرێت...، کاتێك ژمارەیەکی زۆری خەڵك بە گەڕانەوەی مەولانا لە ساڵی ١٨١١دا بۆ سلێمانی هاتنە سەر ڕێبازەکەی، بەتایبەتی ئەو توێژە بازاڕییانەی کە هەلومەرجی پڕ شەڕوشۆڕی میرنشین، زیانی لە بەرژەوەندییەکانیان دەدات.))[1] تەنانەت خەڵکانێکیش کە لە توێژی خوارەوە بوون و دژی ئەو دەرەبەگانە بوون، بەشێوەیەك لە شێوەکان و بەپێی بەرژەوەندییان، لەگەڵ هێزی سیاسیی و ئایینیی و کۆمەڵایەتی پایەختدا بوون و نەیاریتییان دەکردن، ئەمەش وای کردبوو ڕێبازەکە لە دوولاوە خەڵکی لێ کۆببێتەوە. ئەمانە و چەندین خاڵی تریش کە لە ئەم باسەدا جێگەیان نییە، وایانکرد بەخێرایی ڕێبازەکە پەرەبسێنێت و بە کوردستان و سەرجەم ناوچەکەدا بڵاوببێتەوە، هەروەك "ڕیچ"دەڵێت[2] ((لە سەرانسەری تورکیا و وڵاتە عەرەبەکاندا، ١٢٠٠٠ دوازدە هەزار موریدی هەیە)[3]، (مامۆستا "مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس"یش، ژمارەی خەلیفە کوردەکانی مەولانا خالید بە ٢٤ خەلیفە و خەلیفە بێگانەکانیشی بە ٣٢ خەلیفە دادەنێت.))[4]

---

١– ڕیشە و پێشینەی ڕێبازی نەقشبەندی لە کوردستاندا، د. هەڵکەوت مەلا حەکیم خانەقینی، گۆڤاری سەنتەری ستراتیجی (سیاسەتی دەولی) ژمارە ٢١، ساڵی شەشەم ١٩٩٨، ل١٤.

٢– ڕیچ: لە ساڵی (١٧٨٧ز) لە فەرەنسا لە دایکبووە و لە ساڵی ١٨٢١دا کۆچی دوایی کردووە. گەشتەکەی ڕیچ بۆ کوردستان، لە ساڵی ١٨٢٠دا بووە و ئەوەشی کە لە ئێرەدا دەیڵێت، دیارە مەبەستی تا ساڵی١٨٢٠ـە، کە بەدڵنیاییەوە ئەم ڕێژەیە بە پێی ڕەوتی ڕۆژگار، گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

٣– رحله ريج فى العراق عام ١٨٢٠، كلوديوس جيمس ريج، ج١، نقلها الى العربية بهاءالدين نوري، بغداد، ١٩٥١، ص٩٨.

٤– یادی مەردان، سەرچاوەی پێشوو...، ل٨٣– ٨٦.

هەروەها (("عەباس عەزاوی"یش موریدانی تەریقەتی نەقشبەندیی لە هەموو ولاتاندا، بە بیست هەزار کەس دادەنێت.))[1]

## ٤- کورتەیەك لە ژیانی مەولانا خالیدی نەقشبەندیی:

((ناوی "خالید کوڕی ئەحمەد کوڕی حسێن"ـە. لە تیرەی میکایەلی جافە. سالی "١١٩٠- ١١٩٣ ك"، کە دەکاتە "١٧٧٩ ز"، لە ناوچەی "قەرەداغ" لە دایك بووە. هەر لە سەرەتای منداڵییەوە، چووەتە بەرخوێندن و لای ژمارەیەك لە مەلا گەورە و زانا دیارەکانی ئەو سەردەمە، بۆ نموونە "سەید عەبدولکەریمی بەرزنجی" خوێندویەتی، پاشان لای "شێخ قەسیمی مەردۆخی" ئیجازەی وەرگرتووە. پاش کۆچی دوایی مامۆستاکەی "سەید عەبدولکەریمی بەرزنجی" بە فەرمانی "ئەوڕەحمان پاشای بابان" مەولانا خالید لە جێگەی ئەو دانراوە... ئەم زاتە، زانایەکی گەورەی ئایینناسە و لە سەرانسەری خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا، ڕێبەری ڕێوڕەچەی نەقشبەندیی بووە. هەزاران خەلیفە، مورید و مەنسووبی هەبووە. چەندین کتێب و پەراوێزی لە زانستەکانی دین و ڕێوڕەچەی نەقشبەندییدا نووسیوە، لە هەمان کاتدا شاعیرێکی پایە بەرز بووە و دەستێکی بالای لە هۆنینەوەی شیعردا هەبووە، بە زمانەکانی فارسی، عەرەبی و کوردی -بە هەردوو شێوەزاری" گۆران، بابان"ـەوە- شیعری هۆنیوەتەوە. لە ناو میرانی باباندا، کە لە ئەو سەردەمەدا حوکمڕانی ناوچەی سلێمانی بوون، بە ڕێزەوە سەیری کراوە و نامەی زۆر لە نێوان ئەم و ئەو میرانەدا هەبووە.

لە سالی "١٢٢٠ ك-١٨٠٥ز" بەڕێگەی "موسڵ، دیاربەکر، حەلەب، دیمەشق"دا سەفەری حەجی کردووە، دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی، بڕیاری سەفەرکردن بۆ هیندستان دەدات و ئەم بڕیارەشی جێبەجێ دەکات... بۆ گەڕانەوەشی، لە سالی

---

١- مولانا خالد النقشبندي، عباس العزاوي، مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد١، بغداد، ١٩٧٣، ص٦٩٧.

"١٢٢٦ ك" لە سنەوە دەگاتەوە سلێمانی. پاش ماوەیەك، بۆ ماوەی پێنج مانگ ڕوو دەکاتە بارەگای حەزرەتی غەوس لە بەغدا و لە ئەوێ، حەزرەتی شێخ عوسمان سیراجوددینی هەورامیی تەوێڵەیی[١]... تەمەسوکی پێوەکردووە. ئەوانەی کە کەڵك و قازانجیان لەگەڵ بوونی مەولانادا لە سلێمانی یەك نەکەوتووە، دەبن بە ناحەزیی و لە دژی، دەس بە قسە بڵاوکردنەوە دەکەن و گەلێ شتی ناڕەوا و نادروست بەدەمیەوە هەڵدەبەستن و ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم قسانە ڕوو لە زۆربوون دەکات... لە ئەم کاتانەشدا بەهۆی هەرای نەبراوەی نێوان خالید پاشای کوڕی ئەحمەد پاشا و عەبدولڕەحمان پاشای کوڕی مەحموود پاشای گەورەوە، ناوچەی بابان پڕبووە لە پەشێویی، بۆیە مەولانا بڕیاردەدات لە سلێمانی نەمێنێتەوە و لە ساڵی "١٢٢٨ك"دا، دەگەڕێتەوە بۆ بەغدا و تا ساڵی "١٢٣١ یان ١٢٣٢ ك"، لە بەغدا دەمێنێتەوە و دواتر بۆ سلێمانی دەگەڕێتەوە... و مەحموود پاشا خانەقایەکی بۆ درووست دەکات و بۆ ماوەی شەش مانگ لە سلێمانی دەمێنێتەوە... لە ١٨٢٠/١٠/٢٥دا بۆ یەکجارەکی سلێمانی بەجێ دەهێڵێت و بەرەو بەغدا و دواتریش بۆ هەورامان سەفەر دەکات... ساڵانی"١٢٣٦، ١٢٣٧، ١٢٣٨ ك" لە هەورامان بەسەر دەبات و دواتریش بەرەو شام دەکەوێتە ڕێ و لە ساڵی "١٢٤١ ك"دا دەچێتە مەدینە و لە ساڵی "١٢٤٢ ك"، پاش ساڵێك لە گەڕانەوەی حەج، لە شام و لە یازدەی مانگی زی العقدەی ١٢٤٢"١٨٢٧ ز" تووشی نەخۆشی تاعون دەبێت و پاش دوو ڕۆژ، کۆچی دوایی دەکات.))[٢]

١- شێخ عوسمان (١١٩٥-١٢٩٥ك)

٢- یادی مەردان، سەرچاوەی پێشوو...، ل٨- ٥٤.



مزگەوتی خانەقای مەولانا خالیدی نەقشبەندیی لە سلێمانی*

## ٥- ململانێی نێوان ڕێبازی قادریی و نەقشبەندیی:

((کۆنترین تەریقەتی سۆفی لە ناو کورددا، تەریقەتی قادرییە کە بە ناوی دامەزرێنەرەکەیەوە عەبدولقادری گەیلانی "گیلانی، کەیلانی، خەیلانی ١٠٧٧-١١١٦ ك" ناونراوە. ئێستا زۆر خانەدانی ئایینی بە ناوبانگی کورد لە پەیڕەوانی ئەم تەریقەتەن، یان جاران لە پەیڕەوانی بوون. تەریقەتی قادریی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە، لە ژێر تین و فشاری تەریقەتێکی تری سۆفییانەدا کە تەریقەتی نەقشبەندییە، بەردەوام لە پاشەکشەدایە... مەڵبەندی سەرکردایەتی

---

*- بەپێی ئەو تابلۆیەی کە ئێستا بەسەر دەرگای خانەقاکەوە هەڵواسراوە، ساڵی دروستکردنی ئەم خانەقایە بە ١٨١٨ تۆمار کراوە، بەڵام د. هەڵکەوت مەلا حەکیم پێی وایە کە (ساڵی ١٨١٦ مەحموود پاشای میری بابان مزگەوتێکی بۆ دروست کردووە کە تا ئەمڕۆ بە ناوی خانەقای مەولاناوە ناسراوە، بڕوانە (ڕیشە و پێشینەی ڕێبازی نەقشبەندی، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٥.) ئەم وێنەیە لە کتێبی (عنقای بقا در قاف و فا هجرت حضرت بهاءالله به سلیمانیه و کوه سرگلو، امیر فرهنگ ایمانی، نشر دوم، ٢٠٠٧.)

تەریقەتەکە، شارۆچکە دێرینە پیرۆزەکەی بەرزنجەیە کە نزیکە لە شاری سلێمانییەوە... ئێستا خەڵکی کوردستانی باکوور و تارادەیەکیش خەڵکی کوردستانی خۆرئاوا، پەیڕەوی لە تەریقەتی نەقشبەندیی دەکەن. ناوەڕاست و خۆرهەڵاتی کوردستانیش قادریین... مەولانا ساڵی "١٧٧٩ ز"، هەڵمەتێکی بۆ پەیداکردنی لایەنگر لە ڕێگەی دیاریکردنی ژمارەیەکی زۆری نوێنەران لە کوردستان و ئەودیوی کوردستاندا، دەست پێکرد.))[1]

کاتێک مەولانا خالید لە دیهلیی هیندستان دەگەڕێتەوە و بۆ ڕێبازی نەقشبەندیی دەست بە بانگهێشتن دەکات، ئیدی ناوبانگی بە هەموو لایەکدا بڵاودەبێتەوە. لەبەر ئەوەشی کە لە ئەو کاتانەدا و لە سلێمانی تاکە ناودار و تاکە ڕێبازێك، (شێخ مارف نۆدێ ١٧٥٢-١٨٣٨)[2] و تەریقەتی قادریی دەبێت. شتێکی

١- ئاین و تایفە ئاینییەکان لە کوردستان، میهرداد ئیزەدی، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: کامەران فەهمی، بڵاوکراوەی: مەکتەبی بیرو هۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٨١. ئەوەی ڕاستی بێت، وەك نەریتێکی خراپ، ماوەیەکە لەچاپدانی هەندێ وەرگێڕان دەبینرێت کە خودی تێکڕای بەرهەمەکە نین و بەشێکی کەمی بەرهەمەکە دەهێنرێت و ناوی تێکڕای بەرهەمەکەی لە سەر دادەنرێت، بەداخەوە ئەم بەرهەمەش لە ئەو جۆرەیە.

٢- ((شێخ مارف نۆدێ "١٧٥٢-١٨٣٨ ز": کوڕی شێخ مستەفای سەید ئەحمەدی غەزالییە. بەچەند پشتێك دەچێتەوە سەر بابا ڕەسوڵی گەورە. مەزنترین و بەرزترین زانای ئاینییە لەهەموو کوردستاندا. ئەدیب و نووسەرێکی بەتوانا و شاعیرێکی گەورە و بەرز بووە. باوکی حاجی کاك ئەحمەدی شێخە. شێخ مارف لەگوندی نۆدێی سەر بە شارباژێڕ لەدایك بووە. هەر بە منداڵی لەلای باوکی دەستی بەخوێندن کردووە. دواجار لەگەڵ (بێتووشی)ی هاوڕێیدا لەلای (مەلا محەممەدی ئیبنولحاج)ی هەزار مێردی، فیقهی زانستی ئیسلامیی و وێژەی عەرەبی و فارسی خوێندووە و پاشان بۆ سلێمانی گەڕاوەتەوە. لەدێی (دۆڵپەموو) خەرقەی تەریقەتی قادری لە شێخ عەلی بەرزنجی وەرگرتووە و بۆ قەڵاچوالان چووە. بەدەرس وتنەوە و ڕێنمویی خەڵك و نووسینی کتێبەوە خەریك بووە. کەپایتەختی بابانەکان لەقەڵاچوالانەوە بۆ سلێمانی گوێزرایەوە، شێخ مارف کرا بە مامۆستای قوتابخانەی مزگەوتی گەورە... پەیوەندیەکی توندی لەگەڵ سوڵتان و والییەکانی عوسمانی و میرەکانی باباندا هەبووە و

ئاساییە کە ململانێ لە نێوان مەولانا خالید و شێخ مارف، یان تەریقەتی نەقشی و قادریی پەیداببێت، بەتایبەت دوای ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە شوێنکەوتە "تەبەعە" بۆ مەولانا خالد و تەریقەتی نەقشبەندیی پەیدا دەبێت. "ریچ" پلەی مەولانا خالیدمان بۆ دیاری دەکات و دەنووسێت ((موسوڵمانێکی بەناوبانگی گەورە لە سلێمانی دەژی، ناوی خالیدە، بەڵام کوردەکان پێیان وایە کە لەنگییە بۆیان ئەگەر لە حەزرەتی مەولانا کەمتری پێ بوترێت. موسوڵمانەکان قسەکانی ئەو لە پلەی حەدیسی نەبەویدا دادەنێن. ئەم شێخ خالیدە لە خێڵی جافە...، کوردەکان هەموو بە وەلی دادەنێن، زۆریشیان لە پلەی پێغەمبەری خۆیاندا ڕێزی دەکەن. "عوسمان بەگ" پێی وتم: ئەو و پاشا و هەموو سەرکردە کوردەکانیش، موریدی ئەون.))[1]

---

هەمیشە ئامۆژگاری کردوون. شیعر و نووسینەکانی بە هەرسێ زمانی: کوردی، عەرەبی و فارسی نووسیوە. ٥٤ کتێبی هەمەجۆری داناوە، لەسلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان نێژراوە. (ئینسایکلۆپیدیای گشتی، یاسین سابر سالح، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٦٧٩)، بەڵام ژمارەی کتێب و داناوەکانی شێخ مارفی نۆدێ ٤٤ کتێبە نەک ٥٤ کە لە سەرچاوەی سەرەوەدا نووسراوە...

١- رحلە ریچ ف العراق عام ١٨٢٠، سەرچاوەی پێشوو...، ص٩٨.



**حاجی عەبدولڕەحمان فەتحە***

((لە ناو خەڵکیدا ئەوە باوە کە "شێخ مەعرووف نۆدێ" بووە بە ناحەز و دژی مەولانا خالید، ئەمەش وایکردووە کە مەولانا لە سلێمانی دەرچێت و بەرەو بەغداد کۆچ بکات.))[١] تەنانەت ناکۆکییەکان دەگاتە ئاستێك کە ((شێخ مارف، کاك ئەحمەدی شێخی کوڕیی و عەبدولڕەحمان تاڵەبانی خەلیفەی بۆ کوشتنی دەنێرێت[٢]، بەڵام هەردوکیان کاری کوشتنەکەیان بۆ جێبەجێ ناکرێت و دەگەڕێنەوە، ئەگەرچی شێخ مارف بۆ جاری دووەمیش دەیان نێرێتەوە، بەڵام بەختیان لە جاری یەکەم باشتر نابێت و دیسان دەگەڕێنەوە.))[٣] بۆیە مەولانا

*- ئەم وێنەیە لە ئەرشیفی (عەباسی ڤیدیۆ)وە پێشکەش بە لێکۆڵەر کراوە.

١- یادی مەردان، سەرچاوەی پێشوو...، ل٤٤.

٢- (("حاجی عەبدولڕەحمان فەتحە" ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە"مەلا حەسەنی پیاوکوژ" یش لە "تەپەمار"ەوە بۆ کوشتنی مەولانا چووەتە سلێمانی، بەڵام ئەمیش سەرکەوتوو نەبووە.)) (بەرنامەی دیرۆك لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان کەناڵی کەرکوك، ساڵی ٢٠٠٧، ئامادەکردنی سمکۆ بەهرۆز)

٣- ڕیشەو پێشینەی ڕێبازی نەقشبەندی لە کوردستاندا، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢١. کە ئەمیش لە (Rich, op. cit, p. p. ٢٠٢-٢١)ی وەرگرتووە.

خالید ناچار دەبێت هەڵبێت. لە ئەم بارەیەوە ریچ دەنووسێت ((ئەم بەیانییە شێخ خالیدی بەناوبانگ هەڵهات. لەگەڵ ئەوەشدا کە هەڵهاتنەکەی نهێنیی و بە پەلە بوو، بەڵام توانی هەر چوار ژنەکەی لەگەڵ خۆیدا بەرێت. هێشتا نەزانراوە بەرەو کوێ رۆیشتووە؟ چەند رۆژێک لەمەوبەر کوردەکان لەپلەیەکی بەرزتر لە عەبدولقادر دایان دەنا. پاشا عادەتی وابوو لەبەردەمیدا رادەوەستا و قلیانی بۆ تێدەکرد، کەچی ئەمرۆ پێی دەڵێن: کافر و داستانی زۆر لەبارەی فیز و کافریی و زەندیقییەوە، دەگێرنەوە. لەبارەی هۆی هەڵهاتنیەوە، قسەی جۆراوجۆر دەکرێت. هەندێك دەڵێن: دەستی کردبوو بە ئاژاوە نانەوە لە نێوان پاشا و براکانیدا کە ویستبوویان لای پاشا لەگەڵیدا رووبەروو ببنەوە... هەندێکی تریش دەڵێن: دەستی کردبوو بە دانانی بناغەی مەزهەبێکی نوێ و دەیویست خۆی بکات بە گەورەی دنیایی ولاتەکە. گومانی تێدا نییە کە زۆر شتی لەبارەوە وتراوە و شتی زۆر لە ئەمانە زۆرتری دراوەتە پاڵ. مەلا و سەیدەکان، لە سەرووی هەمووشیانەوە شێخ مارف، هەموو رقیان لە شێخ خالیدە و ئەویش کاتێك کە دەسەلاتی هەبوو، هەموو ئەمانەی بەزاندبوو.))[1]

---

١- رحلە ریچ في العراق عام ١٨٢٠، سەرچاوەی پێشوو...، ص٢٢٧- ٢٢٨.



**وێنەی حاجی کاک ئەحمەدی شێخ** *

بەڵام ئەمە هەموو لایەنەکانی ململانێ و ناکۆکییەکان نییە؟ چونکە لە ئەوکاتانەدا ((گەلێك لە مەلایانی ناوچەی سلێمانی کە لە خوێندندا هاوڕێی مەولانا بوون و

---

*– ئەم وێنەیە لە لایەن گەڕیدەیەکی ئینگلیزەوە وێنە گیراوە و هاوشانی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ (حاجی ئەحمەد بەگی بانەیی) بەپێوە وەستاوە. (د. کەمال مەزهەر) لە کتێبی (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد)دا بۆ یەکەمین جار لە کوردستاندا بڵاوی کردووەتەوە کە ئەمیش بەدیاری لە کۆمەڵەی کەلەپوور و فۆلکلۆری کوردی وەرگرتووە.

خۆیان لە ئەو بە باشتر زانیوە، لە وەزعی مەولانا و لە پایەبەرزی لای میرانی بابان و خەڵکی شار و دەوروپشتی، نارەحەت بوون، بەڵام دەستیان نەڕۆیشتووە هیچ بکەن. یەکەم زانای عیلم و تەریقەتیش کە لە ئەو ڕۆژەدا و لە ناوچەکەدا، شێخ مەعرووفی نۆدێ بووە، کە مەلایەکی گەورە و مورشیدێکی پایە بەرز بووە و بەهۆی عەشرەت و تایەفەوە زۆر خاوەن دەسەڵات بووە، چوونەتە لایی و فیتنەییان کردووە، هەر شتێ کە بە عەیبەیان زانیوە، کردوویانە بە چەند قات و وایان نیشانداوە کە ئەم مەولانایە، هاتووە دین تێك بدات و ئاشووب بنێتەوە و شتی ناڕەوا دابمەزرێنێت، ئەویش لەبەر ئاموشۆنەکردنی مەولانا و دڵسافیی خۆی و سوێندخواردنی ئەو کەسە درۆزنانە، ئاڵۆزبووە و بە واجبی ئایینی خۆیی زانیوە... لە دژی مەولانا بجووڵێتەوە، بەڵام سەرەنجام کە ڕاستی بۆ دەرکەوتووە، پەشیمان بووەتەوە و شێخ حوسەینی قازیی و چەند سەیدێکی تری ناردووەتە لای مەولانا بۆ عوزر هێنانەوە.))[1] ئەم ململانێ و ناکۆکییە[2]، زۆر لە ململانێیەکی

---

١- یادی مەردان، سەرچاوەی پێشوو...، ل٤٦.

٢- لە سەر ئەم ناکۆکیی و ململانێیانە، گەلێك بەسەرهات و چیرۆکی دەماودەم هەیە، لە ئەم بارەیەوە (عەبدوڵلا ..ەمەد شەریف) دەڵێت ((لە سەر مەولانا خالید و کاك ئەحمەدی شێخ، من شتێکم بیستووە، دەڵێ: کاتێك مەولانا خالید دێتە سلێمانی و دەست دەداتە تەریقەت دادان، لە ئەم کاتانەدا و لە سلێمانی، کاك ئەحمەدی شێخ بە ناوبانگ دەبێت و تەریقەتی قادریی دادەدات، لە سەر ئەمە، لێیان دەبێتە گفتوگۆ و پیاوچاکان و زانایان لێیان دێنە پێشەوە و دەڵێن: پێویست بە ئەمە ناکات، ئێمە تاقیتان دەکەینەوە، هەر کامتان سەرکەوتوو بوون، ئەوە لە ئێرە- سلێمانی- بمێنێتەوە و ئەوەشتان کە سەرکەوتوو نەبوون، دەبێت ئێرە بەجێ بهێڵێت. ئەوانیش دەڵێن: باشە. وارێك دەکەوێت لە ئەم کاتانەدا و لەدوورەوە لەشاخی گۆیژەوە کەسێك بەبارەوە دەردەکەوێت، خەڵکەکەش ئەمە دەکەنە باسی تاقیکردنەوەکەیان و پێیان دەڵێن: ئەو بارەی لە دوورەوە دیارە، بریتییە لەچی؟ کاك ئەحمەد دەڵێت: ئەوە شووتییە و بۆ من هاتووە! مەولانا خالیدیش دەڵێت: ئەوە حاجەتە و دێنێنی لەلای وەستا سپی بکەنەوە! خەڵکەکە ناردیان بەدوای بارەکەدا و هێنایانە پێشەوە، سەیریانکرد،

کەسبی و کاتیی گەورەتر بووە؟ چونکە کار گەیشتووە ئەوەی کە لە شێوەی ناکۆکی ڕۆژانەدا ببینرێتەوە و ڕووخسارێکی سیاسی بەخۆوە بگرێت، کاتێک کە ((چەوسانەوەی ڕاستەوخۆ لە لایەن پاشاوە، مەولانای هەڵپێچا کە لە سلێمانی هەڵبێت و پەنا بۆ بەغداد بەرێت، شێخ مارف نامەیەکی بۆ والی بەغدا نارد و ناوی "**تحرير الخطاب في الرد علي خالد الكذاب**"ی لێناو تێیدا داوای ئەوەی دەکرد "خالیدی درۆزنی کافر ڕیسوا بکرێت و لە بەغدا وەدەر بنرێت" بێگومان ئەم داوایەی ڕەت کرایەوە. پاشتر هەر خۆی نامەکەی فەوتاند و ئێستا تەنها چەند پارچەیەك لە ئەو نامەیە ماوەتەوە. ساڵی ۱۸۱۲ پاش کۆچی دوایی پاشا، کاتێک مەولانا بۆ سلێمانی گەڕایەوە، ململانێی نێوان هەردوو ڕێبازەکە، لە ناو شاردا ڕەنگی ناکۆکییەکی ڕۆژانەی وەرگرت. تاکتیکی شێخ مارف ئەوەبوو کە هەموو لایەنگرانی لەگەڵ خۆیدا ساز و تەیار بکات و هەوڵیش بدات ململانێکە بخاتە بەردەم دەوڵەتی عوسمانییەوە و لەناو کوردەواریدا نەیهێڵێتەوە، بۆیە شێخ مارف هانی "عوسمان جەلیل مەوسڵی" دا کە کتێبی "**دين الله الغالب علي كل منكر مبتدع الكاذب**" دابنێت، کە مەبەستی مەولانا خالید بوو. محەممەد ئەمین سویدی موفتی ئێراقیش بەداواکاری والی بەغدا –نەك مەولانا خالید– بە کتێبێک بە ناوی "**السهم الصائب في من سمي الصالح بالمتدع الكاذب**" بەرپەرچی دایەوە. مەولانا بەهەمان شێوە بەرەنگاری ئەم تاکتیکە نەبوویەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە،

---

حاجەتە!؟ وتیان: کاك ئەحمەد حاجەتە. ئەویش وتی: وایە. بەخاوەنەکەیان وت: ئەی کە هێنات چی بوو؟ وتی: شووتی بوو بۆ جەنابی کاك ئەحمەدم هێنابوو! هەموولا وتیان: تەواوە و هەردووکتان ئەولیان.)) (چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ عەبدوڵلا محەممەد شەریف، ڕۆژی ۲۰۰۸/۱۱/۳۰، سلێمانی.) هەمان بەسەرهات لە سەر زمانی (حاجی عەبدولڕەحمان فەتحە)ی پیاوماقوڵی هەقەوە بە هەمان شێوە باس دەکرێت ((ئەوەندە نەبێت کە ناوەڕۆکی تاقیکردنەوەکەیان بە پرسیارێکی تر و بە دادوەری عوسمان پاشا دەگێڕێتەوە.)) (بەرنامەی دیرۆك، سەرچاوەی پێشوو...)

تێکۆشا کە ڕێ لە دڵگەرمیی هەندێك لە ئەو لایەنگرانەی بگرێت کە دەیانەویست بەهەمان شێوە بەرپەرچی زەبرلێدانەکە بدەنەوە.))[1]

لە نامەیەکی شێخ مارف نۆدێییدا کە بۆ (یەحیا مزووری) ناردووە[2] هەموو ئەو ڕاستییانەی سەرەوە دەردەکەوێت، کە پەیوەندی نێوان مەولانا و شێخ مارف، چەند خراپ و ئاڵۆز بووە. لە ئەم لایەنەوە، هەندێك لە نەیارانی تەریقەتی نەقشبەندیی و دۆستانی قادریی، بە بەرنامە بێت، یان لە ژێر کاریگەریی سۆزی دەروونیانـدا بووبێـت، بەرامبـەر بـە مـەولانا وەسـتاونەتەوە و هـەوڵی زیـان پێگەیاندنیان داوە، یەکێك لە ئەم کەسانە بەناوی "شێخ ئەحمەدی سەردار"[3]ەوە

---

١- ریشە و پێشینەی ڕێبازی نەقشبەندی لە کوردستاندا، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٩.

٢- دەقی نامەکە بریتییە لە:

((لەتێکڕای زانایانی سلێمانییەوە بۆ زانای زۆر گەورەی دنیا و ئایین: حوججەتولموسلیمینی مەولانا و شێخ یەحیای مزووری خوای گەورە موسوڵمانانی بەتەمەن درێژی ئەو بەهرەمەندکردووە.

پاش سڵاو...

خالیدمان لە ناودا قوت بووەتەوە، کە پاش گەڕانەوەی لە هیندستانەوە بۆ وڵات، لاف ویلایەتی هەرە گەورە و ئیرشادکردن لێدەدات. ئەم کابرایە پاش ئەوەی زانستی بەدەست هێنا، ڕێی سەرلێشێواوی هەڵبژارد، ئێمەش نەمانتوانیوە سەری پێ دانەوێنین و دەمکوتی بکەین، بۆیە دەبێت بێنە لامان و دەمکوتی بکەن، تا سەرلێشێواوی و نیازەکانی دوور بخەنەوە، ئەگینا گومڕایی ئەو، موسوڵمانان دەگرێتەوە و بە وڵاتدا بڵاودەبێتەوە. سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکەتی خواتان لێ بێت.)) (المجد التالد في مناقب الشيخ خالد، أبراهيم فصيح البغدادي، اسطنبول، ١٨٧٢، ص٤١.)

٣- ((شێخ ئەحمەدی سەردار: سەید ئەحمەدی سەرگەڵوویی بەرزنجییە. بە (سەید ئەحمەدی سەردار) ناسراوە. پاش ئەوەی مەولانا لە هیندستانەوە دەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی و دەست بە ئیرشادکردن دەکات، مورید لە هەموو لایەکەوە بۆ خزمەتی دێن... سەید ئەحمەدی سەردار یەکێك دەبێت لە ئەو کەسانەی کە نەیارێتی مەولانا دەکات و لە سەرگەڵووەوە بۆ کوشتنی مەولانا دێتە سلێمانی، دوای ئەوەی کە لە هەوڵی کوشتنی مەولانا پەشیمان دەبێتەوە، دەبێتە یەکێك لە خەلیفە بە ناوبانگەکانی مەولانا و خزمەتێکی زۆر بە موسوڵمانان دەکات. مەولانا لە نووسراوەکانیدا بە (اخونا احمد) ناوی

((بە ئەم نیازە، لە سەرگەڵووەوە بۆ سلێمانی دێت. مەولانایش لە ڕۆژی جومعەدا و لە پاش نوێژی جومعە کە لە مزگەوتی گەورە دێتە دەرەوە، تەوەجوهێکی لێدەکات، ئەویش جەزبە دەیگرێت و لە لای دەست بە سولووککردن دەکات، تا بەپایەی خەلیفەیی دەگات و ئیجازەی ئیرشاد وەردەگرێت.))[١]



**مەرقەدی حاجی شێخ مارفی نۆدێ لە گردی سەیوان لە سلێمانی**

---

سەید ئەحمەد دێنێ و مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە ڕیزبەندی خەلیفەکانی مەولانادا لە پلەی سێیەمدا ناوی هێناوە.)) بڕوانە (یادی مەردان، سەرچاوەی پێشوو،...، ل٨٨.) شێخ ئەحمەدی سەردار: کوڕی شێخ یوسفی کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ یوسفی کوڕی شێخ شەمسەدینی کوڕی شێخ عەبدولسەمەی سەرگەڵوییە.

١- یادی مەردان، سەرچاوەی پێشوو،...، ل٨٨.

## ٦- زنجیرەی تەریقەت پێدان و ئیرشادکردن:

تەریقەتی نەقشبەندیش وەك تەریقەتەکانی تر، لە دوای ئەوەی کە ((شێخ پەیوەندی ڕوحانی دەگرێت و دەچێتە ناخی کەسایەتییەوە و تێدەکۆشێت کە وەك ئەو بێت، ئیتر ئەم حاڵە دەبێتە پەیوەندی ناسراویان.))[1] و زنجیرەی تەریقەت و ئیرشادکردن دێتە ئاراوە.

زنجیرەی تەریقەتی هەقەکان لە مەولانا خالیدی نەقشبەنییەوە دەست پێدەکات و لە شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەدا کۆتایی دێت، بە ئەم ڕیزبەندییە:

١- شێخ ئەحمەدی سەردار

٢- شێخ قادری سوور[2]

٣- شێخ ڕەزای عەسکەر

٤- شێخ محەممەد ئیلەڵڵا

٥- حاجی شێخ مستەفای حاجی شێخ ڕەزای عەسکەر

٦- شێخ مەلا ئەحمەدی گەڵنێری

٧- شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە

---

١- کۆمەڵناسی کوردەواری، د.حوسێنی خەلیقی، بەرگی دووەم، چاپخانەی الحوادث، بەغداد، ١٩٩٢، ل٢٦٧.

٢- مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە ڕیزبەندکردنی خەلیفە کوردەکانی مەولانا خالیدا، دوابەدوای ناوی سەید ئەحمەدی سەرگەڵوبی بەرزنجەیی، بە هەمان ناساندنی (بەرزنجەیی سەرگەڵوبی)ـەوە ناوی (عبدولقادری بەرزنجەیی سەرگەڵوبی) دەهێنێت، کە پێدەچێت مەبەست لە شێخ قادری سوور بێت، چونکە تا ئێستا جگە لە شێخ قادری سوور، کەسێك بە ئەم ناساندنەوە (بەرزنجەیی سەرگەڵوبی) نەناسراوە. خۆ ئەگەر ئەمە وابێت و مەبەست لە سەید عەبدولقادر ئەفەندی ئەلبەرزنجی (شێخ قادری سوور)بێت، ئەوا شێخ قادری سوور باوەڕپێکراوێکی گەورەی مەولانا خالید بووە و ماوەیەك لە شاری مەدینە نوێنەری بووە، وەك لە نامەیەکی مەولانادا کە بۆ کەسە دڵسۆزەکانی خۆی بۆ مەدینەی ناردووە، بە (السید السند الفاضل، والحبر المستند الکامل) ناوی دەبات؛ بڕوانە (یادی مەردان، سەرچاوەی پێشوو...، الرقعة الثامنة و الخمسون، کتبها الاتباعة المخلصین في المدینة المنورة، ل٤٠٢)

وەك لە پێشتردا ئاماژەی بۆ كرا، پەیوەندییەكە لە مەولانا خالیدی نەقشبەندییەوە تا شێخ عەبدولكەریمی شەدەڵە بەسەر حەوت كەسدا تێپەڕیوە. ئەمەش پشتڕاست كردنەوەی ئەو بۆچوونەیە كە بەسەر زاری زۆرێك لە باوەڕدارانی ڕێبازی نەقشبەندیی و هەقەوەیە كە گوایە مەولانا خالید وتویەتی: زنجیرەی تەریقەت پێدان و ئیرشادكردن تا حەوت كەس بۆ خوارەوە شۆڕدەبێتەوە و لە ئەوە بەدواوە، نابێت بمێنێت، ئەمە لە لایەكەوە و لە لایەكی تریشەوە تێبینی ئەوە دەكرێت كە پەیوەندییەكان بریتی نەبوون لە پەیوەندییەكی ئیرشادیی و تەریقەتی پەتی، بەڵكو لە پاڵ ئەمەشدا، بریتی بووە لە پەیوەندی كوڕ و باوك، یان خزمایەتی، هەروەك چۆن لە نێوان شێخ ئەحمەدی سەردار و شێخ قادری سووردا بریتی بووە لە پەیوەندی كوڕ و باوك، لە نێوان شێخ قادری سوور و شێخ ڕەزای عەسكەردا، بریتی بووە لە پەیوەندی نێوان خەزوور و زاوا. لە نێوان شێخ ڕەزای عەسكەر و حاجی شێخ مستەفادا بریتی بووە لە پەیوەندی نێوان كوڕ و باوك. لە نێوان حاجی شێخ مستەفا و شێخ عەبدولكەریمی شەدەڵەشدا، دیسانەوە بریتی بووە لە پەیوەندی نێوان كوڕ و باوك. ئەوەشی كە لە ئەم ڕیزبەندییەدا تێبینی دەكرێت، پەیوەندی نێوان شێخ ڕەزای عەسكەر و شێخ محەممەد ئیلەڵڵا، شێخ محەممەد ئیلەڵڵا و حاجی شێخ مستەفا، حاجی شێخ مستەفا و شێخ مەلا ئەحمەدی گەڵنێری، شێخ مەلا ئەحمەدی گەڵنێری و شێخ عەبدولكەریمی شەدەڵە، ڕاستەوخۆ پەیوەندی ئیرشادیی و تەریقەت بووە، بەڵام لە پشت هەر یەكە لە ئەمانیشەوە، ناڕاستەوخۆ و لە ڕێگەی كەسی پێش خۆیانەوە، پەیوەندییەكە لە شێوەی پەیوەندی خزمایەتیشدا دەركەوتووە، وەك لە پەیوەندی نێوان شێخ ڕەزای عەسكەر و حاجی شێخ مستەفادا بریتی بووە لە پەیوەندی نێوان كوڕ و باوك، هەروەك چۆن لە پەیوەندی نێوان حاجی شێخ مستەفا و شێخ

عەبدولکەریمی شەدەڵەشدا، دیسانەوە بریتی بووە لە پەیوەندی نێوان کوڕ و باوك. بە کورتی، تەنها شێخ محەممەد ئیلەڵڵا و شێخ مەلا ئەحمەدی گەڵنێری وەك دوو کەسی جیاواز و بـ دەر لە پەیوەندی خزمایەتی نێوان پێش خۆیان، لە پێکهاتەی زنجیرەی تەریقەت پێدان و ئیرشادکردندا بە شێوەی سەربەخۆ بەشدارییان کردووە، کە ئەمەش پێویستی بە لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی زۆرتر هەیە. تەنانەت ئەم نزیکایەتیی و خزمایەتییە وای کردووە کە هەندێك پێیان وابێت (شێخ عارف)ی خزمی شێخ عەبدولکەریم، دامەزرێنەری کۆمەڵەکەیە نەك شێخ عەبدولکەریم، هەروەك چۆن خاتوو (هێنی هارۆلد هانسن)[١] لە (ئیدمۆنز)[٢]ەوە ئەمە باس دەکات و دەنووسێت ((بە پێی قسەی گاوان[٣]، کۆمەڵێك لە پیرەوکەرانی نەقشبەندیی بە سەرۆکایەتی حاجی شێخ عارف کۆمەڵەیەکی نهێنییان بۆ

---

١- لەساڵی ١٩٥٧دا و بۆ ماوەی چوار مانگ و نیو، هاتووەتە کوردستان و سەردانی سەرگەڵو و شەدەڵەی کردووە، لە ئەم سەردانەیدا، چی کەلەپووری کوردیی بەردەست کەوتبێت، کۆی کردوونەتەوە و بۆ دانیمارکی ناردونەتەوە.

٢- ئیدمۆنز: لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٣٥- ١٩٤٥)دا کارگێڕی سیاسیی و ڕاوێژکاری حکومەتی بریتانیا بووە لە ئێراقدا. ساڵی ١٩٣٦ سەردانی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەی کردووە و پێدەچێت هەر ئەویش و لەو کاتانەدا ئەو وێنەیەی شێخی گرتبێت کە تا ئێستا لەبەرچاودایە. زمانی کوردی بە قسەکردن و نووسین زانیوە، لە ئەم بارەیەوە (عەلائەدین سەجادی) لە بەرگی شەشەمی (ڕشتەی مرواری)دا، ئەو بەسەرهاتەی نێوان خۆی و ئیدمۆنز باس دەکات کە داوای لێ کردووە بۆچوونی خەلکیی و خۆی دەربارەی کردنەوەی ئێستگەی کوردی لە یافا دەربڕێت، لە ئەوێدا، عەلائەدین سەجادی باس لە کوردیی زانینی ئیدمۆنز، بە قسەکردن و نووسین دەکات. بۆ زۆرتر، بڕوانە (ڕشتەی مرواری، عەلائەدین سەجادی، بەرگی شەشەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٢٥٥- ٢٥٧).

٣- گاوان ١٩٣٨، ١٩٩ (هێنی هارۆلد هانسن)

پێڕەوکەرانی ڕێبازی "ڕووتی- بەرەڵایی" پێك هێنابوو.))[1] هەروەها (ڕەئوف محەمەد زوهدی)یش هەر لە (ئیدمۆنز)ەوە هەمان ناوەڕۆك دەهێنێتەوە و دەنووسێت ((ئیدمۆنز لە کتێبەکەیدا حاجی "شێخ عارف"ی سەرگەڵویی دەکاتە داهێنەری هەقایەتی، تا بیکات بە گورزی دەستی خۆی و بەربەرکانێی خوالێخۆشبوو "شێخ عەبدولکەریم"ی شەدەڵەی پێ بکات و بە "حاجی شێخ عارف" هەڕەشە لە ئەم بکات.))[2]، تەنانەت ئەم بیروبۆچوونە لەناوخۆشدا بەسەرزارەوە بووە، هەروەك (جەمال بابان) دەنووسێت ((لە خزمی خۆم: خوالێخۆشبوو "تاهیر بەگی جەمیل بەگی بابان"م بیستووە کە حاجی شێخ عارف ئەم ڕێگایەی دامەزراند، بۆ ئەوەی کە شێخ عەبدولکەریمی پێ دوور بخەنەوە و خۆیان لە دوای یەك بە وەراسەت بیبەن بەڕێوە، کە بە ئەم قسەیەی تاهیربەگدا، وا دەردەکەوێت کە حاجی شێخ عارف ڕێبازی هەقەی دامەزراندبێت.))[3]

هەر ئەم نزیکایەتییە وای لە مامۆستا (کەریم زەند) کردووە لە سەر پەیوەندی نێوان (شێخ ئەحمەدی سەردار) و (قادری سوور) بکەوێتە هەڵەوە، کاتێك دەنووسێت ((مەولانا خالیدی نەقشبەندیی، لە مێرگەپانەوە هاتووەتە سووورداش و لە ئەوێ شێخ قالە سووری کردووە بە بریکار و جێگر، ئەویش شێخ ئەحمەدی سەرداری کردووە بە جێگر، تا خۆی گەورەبووە.))[4] بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە شێخ ئەحمەدی سەردار، یەکەمین کەس بووە کە تەریقەت و ئیرشادپێکردنی لە مەولانا خالیدەوە دەست کەوتووە و دوای ئەمیش ئەنجا دراوەتە شێخ قادری

---

١- ژیانی ئافرەتی کورد، هێنی هارۆلد هانسن، وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ کوردی: عەزیز گەردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٣، ل٣٤٥.

٢- بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە، رؤوف محمد زهدی، چاپخانەی الحوادث، بەغداد، ١٩٨٥، ل٨٤.

٣- یاداشت نامەی ژیانم، جەمال بابان، چ١، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٨٣.

٤- ئایینستان، کەریم زەند، چ١، چاپخانەی ئەزمر، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٩٥.

سووری کوڕی، واتە: شێخ ئەحمەدی سەردار، باوکی شێخ قادری سوورە نەك وەك مامۆستا کەریم زەند باسی دەکات[1]، هەروەها مەولانا خالیدی نەقشبەندیی خۆی بە تەنها نەچووە بۆ سووورداش و هاوکات لەگەڵ خۆیدا، شێخ ئەحمەدی سەرداریشی لەگەڵ بووە، ئێمە دواتر لە بەڵگەنامەیەکدا کە بریتییە لە نامە گۆڕینەوەیەکی نێوان هەریەك لە مەولانا خالید و شێخ ئەحمەدی سەرداردا، ئەم ڕاستییە زۆرتر دەردەخەین.

یەکەم کەسێك لە سەر دەستی خەلیفەی مەولانا خالید تەریقەتی وەرگرتبێت (شێخ ئەحمەدی سەردار)ە و دواتر بۆ شێخ قادری سووری کوڕی داکەوتووە، ئەمەش وەك دەگێڕنەوە کاتێك ڕوویداوە کە مەولانا خالید دەڕواتە ماڵی شێخ ئەحمەدی سەردار لە سەرگەڵو و چاوی بە شێخ قادر دەکەوێت، ((کە لە ئەو کاتانەدا شێخ قادر منداڵ دەبێت کە مەولانا خالید لە ئامێزی دەگرێت و پێی دەڵێت: ئەمە موریدی خۆمە، ئەنجا کڵاوێکی درێژ و عەبایەکی بەدیاری وەك موفەرك بۆ دادەنێت کە نیشانەی خەلیفایەتییە و دوای کۆچی دوایی شێخ ئەحمەد، سەید تەهای نەهری[2] دێتە کەرکووك و ئەو دیارییەی مەولانا خالید، کە

---

١- لە چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (کەریم زەند) کە لە ڕۆژی ١٤/ ٢٠٠٨/١١دا بەئەنجام گەیەندراوە، لە وەڵامی ئەوەی کە ئایا بەهەڵەدا نەچووە کە پێی وایە یەکەمین کەس، قادری سوورە نەك شێخ ئەحمەدی سەردار؟ وتی: ئەوەی من کردوومە، کارێکی مەیدانی بووە و ئەوەی بیستوومە، ئەوەم نووسیوە، ئیتر هەر کەسێکی تر شتێکی تری لە ئەم بارەیەوە وتبێت، هی ئەویش هەر ڕاستە!

٢- سەید تەهای نەهری: ئەم زاتە، لە ئەولادی شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (حەزرەتی غەوس)ە... زاتایەکی مەنسوب بووە، تەریقەتی لە سەر دەستی مەولانا وەرگرتووە و مەولاناش ئیجازەی خەلافەت و ئیرشادی داوەتێ. پاشان گەڕاوەتەوە بۆ نەهریێ و دەستی بە ئیرشادی موسوڵمانان کردووە. بڕوانە (یادی مەردان، سەرچاوەی پێشوو...، ل٩٨) ئەوەی شایانی باسە، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، هەر یەکە لە شێخ ئەحمەدی سەردار و سەید تەها نەهری، بە کەسانێکی

لای ئەو بووە، بۆ شێخ قادر دەهێنێت.))[1] بەپێچەوانەی ڕەوشی باوی شێخەکانی ئەم دواییەوە، شێخ قادر مۆڵەتەکە دەداتە شێخ ڕەزای عەسکەر کە لە نەوەی ئەم نییە و ئەمیش شێخ محەممەد ئیلەللّا دەکاتە جێگری خۆی و دوای ئەمیش، حاجی شێخ مستەفای کوڕی شێخ ڕەزای عەسکەر و لە ئەمیشەوە بۆ شێخ مەلا ئەحمەدی گەڵنێریی و دواجاریش بۆ شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، دەمێنێتەوە.

---

سەرکەوتووتری ناو ئەو کەسانە دەداتە قەڵەم کە خەلیفەی مەولانا بوون. بڕوانە (هەمان سەرچاوە...، ل٨٦- ٨٧)

١- ڕاپەڕینی عەلەویەکانی زاگرۆس یا لێکۆڵینەیەکی مێژوویی لە سەر ئەهلی حەق، محەمەد عەلی سوڵتانی، وەرگێرانی لە فارسییەوە: حەسەن عەبدولکەریم و کەمال ڕەشید، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٢٤٠.

# بەشی یەکەم

## باسی دووەم

١- پەیوەندی هەقە و تەریقەتی نەقشبەندیی

٢- ناوی هەقە

٣- سنووری جوگرافیای بڵاوبوونەوەی هەقە

## ١- پەیوەندی هەقە و تەریقەتی نەقشبەندیی:

شێخ ئەحمەدی سەردار وەك ناودارێكی ناوچەكە و سەرگەڵو، دیاریكەر و گۆڕەری ئاراستەی تەریقەتی قادریی بۆ نەقشبەندییە كە دواتریش لەسەر دەستی ئەمەوە، سووری تەواوی (حەوت) خەلیفەیی كۆتایی پێهاتووە و بە شێخ عەبدولكەریمی شەدەڵەی دامەزرێنەری ڕێبازی هەقە، گەیشتووە.

پاش ئەوەی مەولانا لە هیندستانەوە بۆ سلێمانی دەگەڕێتەوە و دەست بە ئیرشاد دەكات، مورید لە هەموو لایەكەوە بۆ خزمەتی دێن، ئەمەش وادەكات جۆرێك لە ناحەزیی و ناتەبایی لە نێوان هەردوو تەریقەتی نەقشبەندیی و قادرییدا بێتە ئاراوە. شێخ ئەحمەدی سەردار وەك ناحەزێكی مەولانا و بە نیازی زەرەرگەیاندن، لە سەرگەڵووەوە بۆ سلێمانی دێت و ڕوو لە مزگەوتی گەورە دەكات. كاتێ ((مەولانا لە پاش نوێژی هەینی كە لە مزگەوتی گەورە دێتە دەرەوە، تەوەججوهێك لە سەید ئەحمەدی سەردار دەكات و ئەویش جەزبە دەیگرێت!! لە ئەمەوە تەریقەت لە سەر دەستی مەولانا وەردەگرێت و لە لای ئەو، دەست بە سولووككردن دەكات... تا بە پای خەلیفەیی دەگات و ئیجازەی ئیرشاد وەردەگرێت.))[١] بوونی دوو بەڵگەنامە لەبەردەستماندا، ڕۆشنایی زۆرتر دەخەنە سەر چۆنێتی پەیوەندی نێوان مەولانا خالید و شێخ ئەحمەدی سەردار و ڕوونكردنەوەی زۆرترمان دەدەنێ:

---

١- یادی مەردان، سەرچاوەی پێشوو،...، ل٨٨.

## بەڵگەنامەی یەکەم:

بریتییە لە نامەیەکی[1] مەولانا خالید کە بۆ شێخ ئەحمەدی سەرداری ناردووە و بەدەستخەتی (عەبدولفەتاح ئاکرەیی)[2] نووسراوەتەوە. ئەم نامەیە وەڵامی نامەیەکی لە پێشتری شێخ ئەحمەدی سەرداره کە بۆ مەولانا خالیدی ناردووە و تێیدا ئاگاداری کردووەتەوە کە دەیەوێت بچێتە حەج و مەولاناش بە ئەم نامەیە وەڵامی دەداتەوە کە نووسراوە:[3]

((... کەوتە بەرگوێی ئەم لە بیرکراوە و بووە هۆی وروژاندنی ئارەزووی سەوداگەران، بەڵام لەبەر ئەوەی کارێکی وا گەورە پێویستی بە زۆر شت هەیە و ڕاستکردنەوەی نییەت و دڵسۆزی تەواو، ستوونێکی گەورەی ئەم کارەن و وردە... لە توانای هەموو کەسێکدا نییە. ئەم بێدەسەڵاتە لە سایەی خواوە هەواڵی... پاش ئەوە دەبێت ڕاوەستن تا ئێمەش لە خزمەتدابین، یان دەبێت چی قەرزت بەسەرەوە هەیە، بیدەیتەوە... والسلام علیکم...))

---

١- فۆتۆ کۆپی ئەم نامەیە لە لایەن (عەبدولڕەقیب یوسف)ـەوە لەساڵی ١٩٨٤ دا لە تەکیەی شەدەڵە گیراوەتەوە و پارێزراوە. ئەم نامەیە بە زمانی فارسی نووسراوە و بەشێکیشی ناخوێندرێتەوە، لەبەرئەمە هێمای (...)مان لە شوێنی ئەو نووسینانەدا داناوە کە بۆمان ساغ نەبوونەتەوە.

٢- شێخ عەبدولفەتاح ئاکرەیی: یەکێك بووە لە خەلیفەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندیی و لە دوای شێخ ئیسماعیلی هەنارانیی و شێخ عەبدوڵڵای هەراتی، بووەتە جێنشینی مەولانا و تاساڵی (١٢٥٩ك) بە دڵسۆزییەوە دەست دەکات بە ئیرشادو خزمەت کردنی موسوڵمانان و سەرپەرشتیکردنی کاروباری منداڵانی مەولانا... لە ساڵی (١٢٨٣ك-١٨٦٩ز)، لە ئەستەمبوڵ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی (ئەسکودار)دا نێژراوە... بڕوانە (یادی مەردان، سەرچاوەی پێشوو...، ل٥٦- ٥٧).

٣- بڕوانە دەقی بەڵگەنامەکە (بەڵگەنامەی یەکەم) لە کۆتایی ئەم پەرتووکەدا.

## بەڵگەنامەی دووەم:

بریتییە لە وەڵامی شێخ ئەحمەدی سەردار بۆ مەولانا خالید کە بە هۆنراوە نووسراوە[1]:

غولام و بەندەی خالیدم کرد، خۆم بە سەگی سدیق سەلمان دەزانم
کە من باپیرم گەورەی پێغەمبەران بێ، چ باکم لە باخی بوون هەیە[2]
بە باڵا و قەڵافەی خۆمدا دەنازم لە بەرەکەتی قاسم و جەعفەرەوە
لە وانەی لە سەر (تەیفور) حساب دەکرێن و پێویستیم بە شا و سوڵتان نییە
لە خوردنەوەی بوالحسن پیاڵەیەک دەخۆمەوە، پیاڵەیەک کە مەستم بکات
لە ولات سەفەرکردن هیچ کات بە مەترسی نازانم
لە کۆڕی سەرخۆشاندا، دەڕۆم و بەرنامەی شەیتان تووڕ دەدەم
کە من یەکێکی وەک شا (ئەبوعەلی)م هەبێ، هەمیشە هەر گۆرانی دەڵێم

---

١- ئەم نامەیە لەلایەن (شێخ ئەحمەدی خاڵ)ـەوە پارێزراو بووە و ئێمە لە نووسینێکی (عارف تەیفور)ەوە وەرمان گرتووە، بڕوانە (تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ ئەحمەدی سەرداری سەرگەڵووییەوە بەرەو حەقە، گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٦٩، ساڵی ٢٠٠٢، ل٢١٦-٢١٧) بڕوانە دەقی بەڵگەنامەکە (بەڵگەنامەی دووەم) لە کۆتایی ئەم پەرتووکەدا.

٢- لەئاست لێکدانەوەی ئەم دێڕە هۆنراوەیەدا، (مامۆستا جەعفەر) کەوتووەتە هەڵەوە، کاتێ لێکدانەوەی بە ئەو شێوەیە بۆ کردووە کە ((شێخ ئەحمەدی سەردار، خۆی بە غولام و هەژاری مەولانا خالیدی کورد داناوە.)) بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە: کە شێخ ئەحمەدی سەردار، خۆی بە غولام و هەژاری مەولانا خالید داناوە، چونکە (کردم) بە فارسی، واتای (کردن- دانان)ی هەیە، نەک (کوردبوون) بڕوانە (ئیدارەی کوردی ئاستەنگ و ئاسۆی گەشەکردن، مامۆستا جەعفەر، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ک) دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی ٢٠٠٩، ل٢٥.) هەروەها لە کتێبەکەی (محەممەد عەلی سوڵتانی)شدا، (چ لەلایەن خۆیەوە، یان وەرگێڕەکانی کتێبەکەوە بێت بۆ سەر زمانی کوردی) هەمان لێکدانەوە بە هەڵە کراوە، بڕوانە (ڕاپەڕینی عەلەویەکانی زاگرۆس، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٣٩.)

لە سەر ڕێبازی خواجە یوسف، بەردەوامین لە ڕۆیشتندا

تەپڵی شاهی لێدەدەم و باج لە... وەردەگرم

خواجە عارف و مەحموود، ڕێگای ڕاستیان کردەوە بۆ دڵم

پێویستم بە دەستڕۆیشتن نییە و (أنا الحق)یش نازانم

بەهۆی خواجە عالی سەردەمەوە، لە ئەم ڕێگایەدا هەموو شتم بەدەست هێناوە

دەستەودامانی محەممەدی خواجەی پیران بووم

من دیل و کۆیلەی گەورەی سادام، دڵ و گیانم خاکی بەرپێی ئەوە

خۆم نە لەشم هەیە و نە گیانم هەیە...

لە هیمەت و بەرەکەتی شای شاهبازانەوە کە...

وەها دڵم پڕبووە لە حەمدی خوا، خۆیشم نازانم

بە بۆنی عەتری خواجەی عەتار، دڵم سەدجار گوڵاوی بووە

... کە پێوەندی ڕابیتە دەزانم

لە بەرەکەتی خواجە زاهیدی... فێرخوازین

کە سوپاس بۆ خوا ڕیایی و مەرایی بۆ کەس نازانم

... بێت گووم بووم بەسەر لێشێواوی

سوپاس بۆ خوا هەر خوا دەزانم، بێت هەرگیز نازانم

لە بەرەکەتی شێخی سەرهەندییەوە، ئەگەر چاوم ببەستی

لە چاو تروکانێکدا یا کەمتر... دوڕ و گەوهەر بڵاودەکەمەوە

لە بەرەکەتی ئیمامی ڕەببانی و میری مەعانییەوە

زمانی خۆت ببەستی، دەزانم چ گەوهەرێك لە دڵتایە

ئەی موحەممەدی پەناگەی هەموان، بە خاتری سیف الدین سید نور

دەرمانی دەردی ئەم ئاوارە و سەرگەردانە، بگەیەنە دەستم

ئەی شاهی ضیاءالدین کە هەزاران کەسی داماوی وەك من پابەندی تۆیە

بمخەرە سەر ڕێگای... چونکە من...

---

دڵم وا هاتووەتەوەیەك کە نازانم بێ ئاگایی چییە

ئەی ضیاءالدین بە شابازێك هەزارانی بێ ئاگای وەك من

لە گوناە ڕزگاری بووە ...



خۆشەویستەکەی ئێمە شاراوەیە لە پێش چاوی خەڵکدا

تەنها لەبەر چاوی ئاشقە، جگەر سووتاوەکان دەردەکەوی

لە هەر کوێ بم، تیشکی بالای تۆ دەبینم

تیشکی ڕۆژ چ پێویستی بە باسکردن هەیە!

ئەوەی سەرخۆشی عەشقی تۆ بێ، خەیالی ناچێ بۆ غولام و حۆری

تا ڕۆژی دوایی، سەرگەردانی جوانی تۆیە

ئەگەر باسی ئاشقیی و ئیشق بزانی

ئەو زانینەشت لە بەرەکەتی ئەوانەوەیە کە نیگایان وەك چراوگ وایە

ئەندێشەی ئیشقی تۆ... هەموو کەس ناتوانێ

ئەو بارێکی خەیاڵە... لای ئەوانەی جگەریان هەر خوێنینە

لەگەڵ ئەوەشدا کە بەرنامەی شێخ عەبدولکەریم، درێژەپێدەری تەریقەتی نەقشبەندیی بووە، بەلام لە هەندێ بنەڕەتدا لە تەریقەت لایداوە و ڕێبازێکی تاڕادەیەك سەربەخۆی لێوە هەڵهێنجاوە، تەنانەت لە هەندێ باردا، بەشێوەیەك گۆڕانکاری بەسەردا هێناوە کە هەست بە لێدەرچوون و ناکۆکیش لە نێوانیاندا دەکرێت. بەکورتی بیری هەقە، لادانێکی لە ئاراستەی تەریقەتی نەقشبەندیدا دروست کرد کە لەلایەکەوە لە تێڕوانینی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەوە سەرچاوەی گرتبوو، لەلایەکی تریشەوە لە ئەو گۆشەنیگایەوە سەرچاوەی گرتبوو کە پەیوەندی بە بیری پێشکەوتنخوازیی و دەرەنجامی ئاسۆی گۆڕانکاری: ئایینی، کۆمەلایەتی، ئابووریی و نەتەوەیی ئەو ڕۆژگارە هەبووە، چونکە وەك دەزانین لە

دوای هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە، ناوچەکە و کوردستانیش، کەوتبوونە بەر کاریگەریی و دەرئەنجامەکانی ئەو گۆڕانکارییانەی کە هاتبوونە ئاراوە، وەك: ئەو جووڵانەوە جووتیارییەی کە لە لای جووتیاران بەگشتیی و جووتیارانی کوردستان بەتایبەتی، لە ژێر سۆزی گۆڕانکارییەکانی جیهاندا چەکەرەی کردبوو، دەنگدانەوەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر کە جۆرە سۆزدارییەکی لە لای خەڵکی کوردستاندا پەیدا کردبوو، هەروەها ڕاپەڕینی گەلانی ئێراق دژ بە بریتانیای داگیرکەر و... هتد. کاتێکیش ئاراستەی درێژکراوەی تەریقەتی نەقشبەندیی لەگەڵ ئەم گۆڕانکارییانەدا بەریەك دەکەون، ئاساییە کە وەك پێشینان تەریقەتەکە جێبەجێ نەکرێت و قسەکردن بە تەنها لە سنووری ئایین و بابەتی خواناسیی و زیکردا، چرنەبێتەوە و بیری هەقە بەسەر کۆمەڵێك ئاراستەی نەقشبەندیدا بازبدات و شتی نوێتر بهێنێتە ئاراوە، هەروەك چۆن کە بیری هەقە ((گەلێ شتی وای تێدایە کە لە ڕێبازی ئایینییدا نین و لەگەڵیدا ناگونجێت، چ لە رووی ئایینی رووتەوە وەك: گوێنەدانی هەندێکیان بە نوێژکردن و ڕۆژووگرتن، یان لە مەیدانی کۆمەڵایەتیدا وەك: هەڵوێستیان دەربارەی ئافرەت و هاوسانیی ئابووریی و... کە دەتوانین بڵێین: تێکڕا ڕێبازی هەقە گەلێ پەیوەندی بەو ڕێبازە ئایینی و فەلسەفییانەوە هەیە کە بەدرێژایی مێژوو لە ناو موسوڵمانانا پەیدابوون و لام وایە جێ پەنجەی هەندێ ڕێبازی فەلسەفی نوێشی پێوەبێت و تێکڕا لە هەستکردن بە پێویستییە ژیارییەکانی کۆمەڵگایەکی جووتیارانی موسوڵمانی کوردەوە، هەڵقوڵاوە.))[1]

---

١– ئاوردانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پەراوێزی ژمارە ٢، ل٣٦– ٣٧.

## ٢- ناوی هەقە:

### وەك زاراوە:

جگە لە ئەوەی وشەی هەق (الحق)، یەکێکە لە ناوەکانی خوا، هەروەها بە مانای ((حەق، پامز، فسەیێ ڕاس، لانانەوە لە خوا.))[١] و ((ڕەوا، کرێ، بەش، ڕاست و دروست، کۆلێن و دانەوە))[٢]ش دێت.

### وەك چەمك:

لە قورئاندا ١٩٤ جار ئەم وشەیە ناوی هاتووە و بە چەند مانایەکی جیاواز بەکار هاتووە. یەکەم: بە مانای (ماف) هاتووە، وەك ﴿فَلَمَّا أَنْجَاهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ...﴾[٣] واتە ﴿جا کاتێ کە ئەوانی ڕزگار کرد، دووبارە لە زەویدا بەبێ ئەوەی کە مافیان هەبێت، ستەم دەکەن...﴾[٤]. دووەم: بە مانای (ڕاستیی و ڕەوایی) هاتووە، وەك لە ئەم ئایەتانەدا دەردەکەوێت ﴿وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَى أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ...﴾[٥] واتە ﴿هەر کاتێك کە ببیستن ئایەتێك بۆ پێغەمبەر نازڵ بووە، چاویان پڕدەبێت لە فرمێسك؟ چونکە ئەوانە هەق و هەقیقەتیان دەرك پێکردووە...﴾ و ئایەتی ﴿لَهُ دَعْوَةُ الْحَقِّ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ لا يَسْتَجِيبُونَ لَهُمْ بِشَيْءٍ...﴾[٦] واتە

---

١- فەرهەنگ باشور، عباس جلیلیان (ئاکۆ) چاپ اول، انتشارات پرسمان، تهران، ١٣٨٥، ل.٧٩٠.

٢- فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە، هەژار، چاپ سوم، انتشارات سروش، تهران ١٣٨١، ل٩٨٢.

٣- القران الکریم، سورة یونس، آیة ٢٣.

٤- بۆ وەرگێڕانی ئەم ئایەتەو ئایەتەکانی دواتریش، پیشت بە ئەم سەرچاوەیە بەستراوە (قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی: مامۆستا محمد صالح ابراهیمی وهیئت محققین و مصححین، چاپ١، چاپخانە بزرگ قران کریم، ١٤١٧هجری قمری) بەستراوە.

٥- القران الکریم، سورة المائدة، آیة ٨٣.

٦- القران الکریم، سورة الرعد، آیة ١٤.

﴿بانگهێشتکردن بۆ لای هەق، هەر هی خوایە و کەسێك جگە لە خوا بانگ بکات، وەڵامی نادرێتەوە...﴾ هەروەها ئایەتی ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا اتَّبَعُوا الْبَاطِلَ وَأَنَّ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّبَعُوا الْحَقَّ مِنْ رَبِّهِمْ...﴾[1] واتە ﴿کەسانێك کە کافر بوون، شوێن کاری باتڵ کەوتوون و کەسانێکیش کە کاری چاکیان کردووە، شوێن هەق کەوتوون کە لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتووە...﴾

هەندێك جاریش وەك سیفەت دراوەتە پاڵ ناوێك، وەك (ڕۆژی قیامەت هەقە) لە ئایەتی ﴿وَالْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ الْحَقُّ فَمَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[2] واتە ﴿داوەریکردن لە ڕۆژی قیامەتدا هەقە، کەسانێك کە تای تەرازوویان قورسە، سەرکەوتوون.﴾ بەمانای (قورئان هەقە) لە ئایەتی ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ...﴾[3] واتە ﴿ئایا کاتی ئەوە نەهاتووەکە برواداران دڵ و دەروونیان بۆ یادی خوا و قسەی خوا "قورئان" بلەرزێت...﴾ هەروەها بەمانای (خوا هەقە) لە ئایەتی ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ﴾[4] واتە ﴿ئەمە لەبەر ئەوەیە کە بەڕاستی خوا هەقە...﴾ بەکار هاتووە.

بەڵام سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئەم ڕێبازە و وشەی (هەقە) بەیەکەوە، نازانرێت بە کام مانا و لێکدانەوەیان وەرگیراوە! ئەوەندە نەبێت تەنها دەزانرێت واتای (ڕاستیی و ڕەوایی) دەگەیەنێت، جا ئەم ڕاستیی و ڕەواییە خوا بێت، یان ڕاستگۆیی، برایەتیی، هاوبەشی و هەر شتێکی تر... هەروەك (شێخ هاوڕێ[5])

---

١- القران الكريم، سورة محمد، آية ٣.

٢- القران الكريم، سورة الأعراف، آية ٨.

٣- القران الكريم، سورة الحديد، آية ١٦.

٤- القران الكريم، سورة لقمان، آية ٣٠.

٥- شێخ هاوڕێ: کوڕەزای مامەڕەزای برای شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەیە، لە دوای مردنی کاکەحەمەی باوکییەوە، کاروباری خانەقای کەلکەسماق بەڕێوە دەبات.

دەڵێت ((وشەکە لە ئەوەوە دروست بووە کە ئەو کاتەی خەڵکەکە بۆ هەموو شتێك، وشەی هەقەیان بەکار هێناوە، بۆ نموونە: وتویانە: خوا هەقە، ئەو کارە هەقە...))

(ئامانج تەها ڕەزا) دەنووسێت ((هەندێك، زاراوەی هەقە، بە ئەهلی هەق یان ئالی هەقەوە پەیوەست دەکەن، ئەمەش کاتێك کە شێخی هەقەکان، دۆستایەتیی و تێکەڵاوی لەگەڵ "سەید محەممەد عەلی باب"دا پەیدا دەکات.))[1] وەك دەردەکەوێت لە نێرەدا جگە لە ئەوەی کە ئەهلی هەق و بەهائییەکان -کە دوو باسی جیاوازن- تێکەڵ بە یەکتری کراون، هەست بە ئەوەش نەکراوە کە (سەید محەممەد عەلی باب) (میرزا حەسەن عەلی) نییە کە بە بەهائوڵڵا ناسراوە و ماوەیەك هاتووەتە سەرگەڵوی ناوچەی سووورداش! هەروەك چۆن (عومەری فاروقی)یش لە سەر ئەم بنەمایە، هەوڵدەدات هەقەکان بە بەهائییەکانەوە[2] ببەستێتەوە!؟ کە دیارە ئەم بۆچوونە بە بەڵگەی زانستیی و مێژوویییەوە پشتڕاست نییە و لە بەشی دواتردا، بوون و نەبوونی پەیوەندی ڕێبازی هەقە لەگەڵ هەریەك لە ئەهلی هەق و بەهائییەکاندا، دەخەینە ڕوو.

(محەممەدی عەلی سوڵتانی) هەوڵ دەدات وشەی هەقە بباتەوە سەر ئەهلی هەق، کاتێك دەنووسێت ((ناولێنانی بزاڤەکە، بەڕواڵەتدا وادیارە کە لە ئەو زیکرکردنە بەردەوامەی پەیرەوکەرانییەوە هاتبێت کە وشەکەیان وتووەتەوە و دووبارەیان کردووەتەوە، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین کە وشەی هەقە، زیکری بەردەوامی

---

١- بزووتنەوەی هەقە، نامەی بەکالۆریۆسی خوێندکار: ئامانج تەها ڕەزا، کۆلێژی یاسا و ڕامیاری- نێواران، زانکۆی سلێمانی، بەسەرپەرشتی: م. یوسف گۆران، ٢٠٠٨، ل٩.

٢- تەریقەتی هەقە، عومەری فاروقی، گۆڤاری سروە، ژمارە ١٥، مەهاباد، ١٩٩٢، ل٢٤.

عەلەوییە توندڕەوەکانی ئەهلی حەق یان ئالی حەق بووە و ئەم ناولێنانە هەروا بە ئاسانیی و سانایی و ڕێکەوت هەڵنەبژێردراوە.))[1]

(محەممەد مەلا کەریم) دەنووسێت ((مـن وای بۆدەچم ناونانی کۆمەڵەکە بە"هەقە"، لە شێخ عەبدولکەریم خۆیەوە بووبێت... ناونانەکەش پەیوەندییەکی بە پاشماوەی کۆمەڵی "ئەهلی هەق"ـەوە هەبێت کە ئێستا لە گەلێ لای کوردستانی ئێراق و ئێراندا هەن. لە هەموو ئەمەش زۆرتر، وشەی "هەقە" تێکڕا بەسەر زمانی پێشەوایانی تەسەوفەوە بووە.))[2] ئەمەش لە کاتێکدایە کە ئەم سۆفییانە، لە زیکر و کار و کردەوەی ژیانی ڕۆژانەیاندا، ئەم وشەیەیان دووبارە کردووەتەوە و بەسەر زاریانەوە بووە و ((هەر قسەیەکی ڕاستیان بیستبێ و هەر کردەوەیەکی بەجێیان دیبێ، وتویانە"هەقە" و ئیتر وردە وردە ناوی "هەقە"یان بەبەردا بڕاوە.))[3] و لە ئەمانیشەوە وشەکە بۆ سەر زاری خەڵکی ناوچەکە بڵاوبووەتەوە و دواتریش بۆ سەر زاری خەڵکانی تر و سەرەنجام بووە بە ناوی تێکڕای باوەڕدارانی ئەو بەرنامەیەی کە شێخ عەبدولکەریم دای مەزراندووە.

وەك دەگێڕنەوە ئەم ناولێنانە لە سەرەتادا بەکار نەهاتووە و ماوەیەکی پێچووە، ئەنجا بەکارهێنراوە، جا لە لایەن خۆیانەوە بێت یان لە لایەن کەسانی ترەوە بووبێت، گرنگ نییە، بەڵکە گرنگ ئەوەیە کە خۆیان پێیان خۆش بووە کە بە ئەو ناوەوە بانگ بکرێن و لەلایەن خۆشیانەوە، هیچ پێناخۆشبوونێکیان بەرامبەر بە بەکارهێنانی ئەم ناوە نەبووە و لەلایەن خۆشیانەوە بەکارهێنراوە.

((ئەم وشەیە لە سەرەتادا زۆرتر لای ئەوانە دەرکەوتووە و بەکارهاتووە کە لە حاڵەتی زیکری نهێنیی و خۆتەرخانکردن بۆ بەندایەتی خوا، لە خەیاڵێکی قوڵدا بوون. ئەمانە، کەوتوونەتە حاڵەتێکی بێهۆشیی و بێئاگایی لە خۆیان و لە

---

١- ڕاپەڕینی عەلەوییەکانی زاگرۆس، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٤٢.

٢- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پەراوێزی ژمارە ٧، ل٣٩.

٣- هەمان سەرچاوە، ل٣٩.

دەوروبەریان.))[1] واتە سەردەمی بەکارهێنانی وشەی هەقە، بۆ ئەو چەند سۆفییەی سەردەمی شێخ عەبدولکەریم دەگەڕێتەوە کە وشەی هەقەیان لە ئاستێکی بەربلاوتردا بەکارهێناوە، شتێکی ئاشکراشە کە چەمکی "هەق" لە بیر و بەکارهێنانی سۆفیدا، پانتاییەکی زۆرتری وەك لای خەڵکانی تر داگیرکردووە، چونکە ((ئەگەر لە لای خەڵکی ئاسایی هەق چەند مانایەکی هەبێت، ئەوا لای سۆفی، هەموو هەقیقەتەکان لە ئەنجامدا دەچنەوە سەر یەك هەقیقەت کە ئەویش "بەمانای خوای پەروەردگار دێت.")[2]

## ٣- سنووری جوگرافیای بڵاوبوونەوەی هەقە:

ناتوانین بە یەك شێوە سنووری دابەشبوونی جوگرافی بۆ باوەڕدارانی ڕێبازی هەقە دیاری بکەین؟ چونکە لە لایەکەوە بارودۆخی سیاسی ئەو ماوەیەی کە ئەم ڕێبازەی تێدا دەرکەوتووە، نەیهێشتووە هەقەکان لە یەك ناوچەی دیاریکراودا و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو نیشتەجێ بن و دوای ساڵی ١٩٨٨یش هەڵمەتی ڕاگواستنی شوێنی زۆرێکیانی گۆڕیوە و نیشتەجێی ئۆردووگا زۆرەملێکانی کردوون، لە لایەکی تریشەوە، لە دوای کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریمەوە، مامەڕەزایی و حەمەسووریی و حەمە ئاغایی، وەك سێ شێوەی تری هەقایەتی هاتوونەتە ئاراوە کە ئەمەش وادەکات بۆ هەر یەکەیان دابەشکردنی تر بهێنینەوە. تەنانەت لە هەندێ شوێندا، لە نێوان هەقەیی و ئەماندا، هاونیشتەنیی هەبووە، ئەمە جگە لە ئەوەی کە دروستکردنی بەستی دوکانیش هەندێك لە گوندەکانی بەژێر ئاوەوە کردووە.

لە ناو ئەو نووسراوانەی کە لە سەر شوێنی نیشەجێ بوونی هەقەکان نووسراون، هەندێکیان سنووری جوگرافییەکە بۆ چەند شوێنێك بچووك دەکەنەوە،

---

١- کۆمەڵناسی کوردەواری، سەرچاوەی پێشوو،...، ل٢٢١.

٢- الصوفيه، أ. د. عبدالقهار داود العاني، مركز البحوث و الدراسات الأسلامية، الطبعة الأولى، بغداد، ٢٠٠٨، ص١٧.

وەك لە ئینسایکلۆپیدیای گشتیدا هاتووە ((تەنها لە ناوچەی سووورداشی نزیك شاری سلێمانی و چەند گوندێکی کەرکووکدا، بڵاوبوونەتەوە.))[1] بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت، سنوورەکە زۆر لە ئەمە زۆرترە و ((جگە لە سەنتەری پارێزگای هەولێر، لە شارۆچکەکانی تۆپزاوا، بەنی سڵاوە و قەزای کۆیە و دێهاتەکانی، لە ناحیەی تەقتەقیش، هەن.))[2] هەروەها لە ((تۆربە، گەڵنێری[3]، سارتکە و کلکە سماق، لە ناوچەی شوان شێخ بزێنی و دێهاتی قەڵاسێوکە، ئاغجەلەر، ناوچەی سووورداش و خەڵەکان، کۆیە دیوی خەرابە و قازی بەگیان و کڵێسە تا دەچێتەوە "ساتوقەلا" بازیان، لە ناو جافەکانی خورخورە[4]، یاخیان، کوێرەکانی، شارستێن لە بنگرد لە ناوچەی قەڵادزە، سەنگەسەر، بەستەسێن[5]، ڕانیە، دوای دروستکردنی بەستی دوکان و دوای ئەوەی دێهاتی هەقەنشین وەك دێهاتەکانی تری ناوچەی بتوێن و شوێنەکانی تری حەوزی دوکان کە بوون بەژێر ئاوەوە، دانیشتوانی دێهاتی "تۆربە و گەڵنێری" و دێهاتی ناوچەی بنگرد[6] و خۆشاو و مەلا

---

١– ئینسایکلۆپیدیای گشتی، یاسین سابر ساڵح، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١١٢٠.

٢– بزوتنەوەی هەقە لە دەمکەلی کەلکەسماقەوە، حاکم صالح، گۆڤاری هاموون، ژمارە ٥٤، ساڵی ٢٧٠٦ ی کوردی، ل٥.

٣– گەڵنێری: لە کاتی خۆیدا گوندێکی سەر بە ناوچەی میرزا ڕۆستەم بووە، بەڵام دوای دروستکردنی بەنداوی دوکان، لەگەڵ چەند دێیەکی تردا، بوون بەژێر ئاوەوە و دانیشتووانەکەیان، بۆ ناوچەکانی تری وەك (سابوراوا، چوارقوڕنە و بەکرەجۆ) گوازرانەوە.

٤– لە نێرەدا ناوەکە بە هەڵە بە (خورش خوڕە) تۆمار کراوە و مەبەست لە (خوڕخوڕە)یە.

٥– بەستەسێن: بەستەستێن.

٦– جگە لە ناوەندی ناحیەی بنگرد، لەچەند گوندێکی تری سەر بە ناحیەکەدا وەك (سیدەر، دۆڵەبی، هەنجیرە، قەرەتەپە، دێلێژە، مەمەنداوە، مەلاسەق، مەرگە، چنارنە) هەروەها لە گوندەکانی (سیوکانی و کانی تو کە حەمە ئاغا دوای کۆچی شێخ عەبدولکەریم پشتی پێ بەستبوون) کەم تا زۆر ژمارەیەك لەهەقەکان نیشتەجێ بوون (نامەیەکی "ڕەشید محەممەد عەلی" بۆ لێکۆڵەر لە ٢٠٠٩/١١/٢٥ دا)

هۆمەر و خەرەکریسە ئەمانەیان هێنایە بەکرەجۆ، لە ئەوێ، ئەرز و ئاویان درایە و ناونران "بەعراوییەکان–بەحراوییەکان"[1] کەوابوو بەژێر بەحرەوە. بەحرەکەش زێی حەوزی دوکان بوو.))[2]، بەلام بە دروستکردنی بەستی دوکان، ((میرزا ڕۆستەم خۆیی و دێهاتەکانی "تۆربە، گەلنێری، مەلا هۆمەر" و کەم و زۆر لە زەوی دێهاتی "خدران و قوڕالە و دەشتی بتوێن و گەلێك شوێنی تر" بوون بە ژێر ئاوەکەوە...))[3] ئەمە جگە لە ((دۆڵی جافایەتی، ناوچەی ئاغجەلەر، مەرگە، پشدەر، بتوێن، عەسکەر، دەشتی کۆیە، گەرمیان، کەرکوك.))[4] بەلام هەندێکیش لە ئەم سنوورەدا زیادەڕەوی دەکەن و شوێنی تری دەخەنە سەر کە دوورە لە ڕاستییەوە و لەگەڵ بابەتی تردا تێکەلاویان دروست کردووە، وەك: شێخ هاوڕێ دەڵێت ((هەقە لە زۆر ناوچەی کوردستاندا هەیە و لە کوردستانی ئێران و ناوچەی سلێمانیی و سەرگەلو و دوکان و هەولێر و کەرکووکیش.))[5] کە ڕەنگە شێخ هاوڕێ لە نێوان هەقە و ئەهلی هەقدا تێکەلییەکی کردبێت!

بەکورتی دەتوانین پشت بە بۆچوونەکانی شاکیر فەتاح ببەستین کە پێی وایە ((بەهەموو لایەکی "کوردستانی ئێراق"دا بەتایبەتی بە ناو بەشی "سۆران"دا

---

١– بەعراوییەکان– بەحراوییەکان: مەبەست لەخەلکی ئەو ناوچانەیە کە گوندەکانیان کەوتووەتە ژێر ئاوی بەستی دوکانەوە و میری گواستوونییەتەوە بۆ چەند ناوچەیەکی تری وەك (بەکرەجۆ، کەندەکەوە، چوارقوڕنە، ژاراوە، سلێمانە دێ، سەنگەسەر، هەیاسی لەبازیان و چەند شوێنێکی تر...) جا لەبەر ئەوەی خەلکی ئەم ناوچانە دەنگی (ح) بە (ع) و بەپێچەوانەشەوە بەکاردەهێنا، لەلایەن خەلکانی ترەوە بە بەحراوییەکان و لەلایەن خۆشیانەوە بە بەعراوییەکان ناوهێنراون. (نامەیەکی "ڕەشید محەممەد عەلی" بۆ لێکۆلەر لە ٢٠٠٩/١١/٢٥ دا)

٢– یاداشت نامەی ژیانم، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٨٢– ١٨٣.

٣– هەمان سەرچاوە، ل١٧٧.

٤– تێڕوانینێك بۆ ڕابردووی هەشتاساڵەی گروپی هەقە، لێکۆڵینەوەی: عەبدولکەریم مەحموود، گۆڤاری تایم، ژمارە ١١، ساڵی ١٩٩٩، ل٢٢.

٥– دیدارێك لەگەڵ ڕابەری بزوتنەوەی هەقەدا، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٧.

بڵاوبووبووەوە.))[1] لە چەمچەماڵدا ((لە نزیکەی"٣٥" گونددا دانیشتوون.))[2] و لە ناوچەی ڕانیەدا (دوو سێ گوندێکیان هەبووە)[3] لە هەموو ئەمانەوە تێدەگەین کە: سنووری دانیشتوانی هەقە، بەشێوەیەکی گشتی کەوتووەتە ناوچەکانی دەوروپشتی دەریاچەی دوکانەوە و بە چڕی بە پارێزگای سلێمانیدا بڵاوبوونەتەوە و لە سەنتەری هەر دوو پارێزگای کەرکووك و هەولێریشدا هەبوون و لە چەند ناوچەیەکی زۆر کەمی ئەم دوو پارێزگایەشدا، نیشتەجێ بوون وەك لە وێنەکەدا دیارە.



**نەخشەی دابەشبوونی جوگرافیی هەقە نشینەکان لە هەرێمی کوردستانی ئێراقدا***

---

١- ئاوێنەی ژینم، شاکر فەتاح، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٠٥، ساڵی ١٩٨٥، ل١٨٨.

٢- کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ، سەرچاوەی پێشوو...، ژمارە٧، ل١٠٢.

٣- هەمان سەرچاوە، ل١٠٢.

*- سنووری کارگێڕی ئەم نەخشەیە، لە (نەخشەی کارگێڕی هەرێمی کوردستانی ئێراق، ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی پەروەردە، ب. گ. پرۆگرام و نەخشە پەروەردەییەکان، هەولێر، ٢٠٠٦)ەوە وەرگیراوە.

# بەشی دووەم

باسی یەکەم: شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە

باسی دووەم: مامەڕەزا

باسی سێیەم: حەمەسووری کڵاوقوت

# باسی یەکەم:

## شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە



**گوندی شەدەڵە- ناوچەی سووورداش- سلێمانی**

بە هۆی ئەوەی کە شێخ عەبدولکەریم، لە گوندی شەدەڵە[1] لە دایک بووە، بە حاجی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە ناسراوە. ((کوڕی حاجی شێخ مستەفای کوڕی شێخ ڕەزای عەسکەرە و دەچنەوە سەر شێخ ئەحمەدی سەردار، یاخود

---

١- ئیدمۆنز بە ئەم شێوەیە باسی ئەم گوندە دەکات: شەدەڵە لە شیوێکی تەنگی بەشی سەرووی ڕووباری تابین، لە نێوان چەرمەپان و پیرەمەگروون، هەڵکەوتووە... خانەقاکەی لەبان زەوییەکی ڕێك و بەرز بە بناری چیادا، دروست کراوە. لەبەشی سەرووی لای خۆرئاوای ئەم بەرزاییەدا، ڕیزێك سپیداری جوان و سێبەری وەك خۆیان جوان، وێنەی ناو فەرشە ئێرانییەکانیان، ئەوەندەی تر گوندەکەی ڕازاندبوویەوە. ئەو فەرشانەیان بۆ لە سەر دانیشتنی میوان، لە لێوار حەوزێکی بەردچنی گەورە ڕاخستبوو کە ئاوی جۆگەلەیەکی لە چیاوە بۆ دەهات. بڕوانە (کرد ترك عرب، سي. جي. ادموندز، ترجمة: جرجيس فتح الله، بغداد، مطبعة التايمس، ١٩٧١، ص١٨٧.)

شێخ ئەحمەدی خورزا، کە خوشکەزای حاجی کاك ئەحمەدی شێخە.))[1] و لەمەش دوورتر دەچنەوە سەر شێخ عیسیٰ و شێخ موسێی بەرزنجە.



شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە*

سەبارەت بە ساڵی لە دایکبوونی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، بیر و بۆچوونی جیاواز لە ئارادایە. (مستەفا عەسکەری) دەنووسێت ((لە دەوروبەری ساڵی ١٣١٠ ك، کە دەکاتە ١٨٩٢-١٨٩٣ز، لە دایك بووە.))[2] بەڵام لە ((شناسنامە عوسمانییەکەیدا، کە لە ٢٢ی مایسی ساڵی ١٣٢١ی ڕۆمیی دەرچووە، نووسراوە: لە ساڵی "١٢٨٨ك" لە دایك بووە، کە بە بەراورد لەگەڵ ساڵی زایینییدا، دەکاتە

---

١- یاداشت نامەی ژیانم، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٧٧.

*- ئەم وێنەیە لە کتێبی (کورد تورك عەرەب)ەوە وەرگیراوە، بڕوانە (کورد تورك عەرەب، سیسیل جۆن ئیدمۆندس، وەرگێڕانی: حامید گەوهەری، هەولێر، دەزگای ئاراس، چ٢، ٢٠٠٤.)

٢- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٣١.

سالی ۱۸۷۱ یان ۱۸۷۲.))[1] ئەگەرچی (محەممەد مەلا کەریم) پێی وایە ئەم ساڵە (۱۸۷۱-۱۸۷۲) بۆ دیاریکردنی لە دایکبوونی شێخ، پێناچێت دروست بێت، چونکە ((لە وانەیە بەمەبەستی لە کۆڵکردنەوەی سەربازی نووسرابێت، کە ۲۳ی مایسی ۱۳۳۱، ڕێکەوتی ۲۳ی مایسی ۱۹۱۷ دەکات و گەرمەی شەڕ بووە. بەڵگەی ناڕاستی ئەم مێژووەش ئەوەیە کە یەکەم: ئەو وێنەیەی شێخ عەبدولکەریم، کە ئیدمۆنز لە کتێبەکەیدا بڵاوی کردووەتەوە- دیارە دەبێت خۆیشی گرتبێتی کاتێک لە ساڵی ۱۹۳٦دا شەوێك میوانی بووە لە شەدەڵە- وێنەی کەسێك نییە کە لە ۱۸۷۱-۱۸۷۲دا، لە دایك بووبێت"برِوانە: کرد ترك عرب، سی. جی. أدموندز، ترجمە: جرجیس فتح الله، مطبعة التایمس، بغداد، ۱۹۷۱، ص۸۸ و فۆرمەی وێنەکانی نێوان لاپەڕە ۲۷۲، ۲۷۳ " دووەمیش: شێخ حوسێنی خانەقا[2] دەڵێت "من لە "۱۳۳۱ك- ۱۹۱۲یان ۱۹۱۳ز"دا لە دایك بووم و جیاوازی تەمەنی من و ئەو ۲۰-۲۲ ساڵێك دەبوو" کە ئەمەیش وادەگەیەنێت شێخ عەبدولکەریم لە هەڕەتی تەمەنی سەربازێدا بووە کە شناسنامەکەی بۆ دەرهێنراوە و بە ئەم پێیە، دەبێت لای کەمی، بیست ساڵێك تەمەنی بۆ زۆر کرابێت.))[3]

---

۱- هەمان سەرچاوە، ل۳۱.

۲- شێخ حوسێنی خانەقا: کوڕی سەید ئەحمەدی خانەقا کوڕی حوسێن کوڕی عەبدولقادر کوڕی سەید ئەحمەدی سەردار بەرزنجییە. لە ساڵی۱۹۱۳ لە کەرکوك لەدایك بووە و دوای کۆچی دوایی سەید ئەحمەدی باوکی، ئەم جێگەی گرتووەتەوە.

۳- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی حەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل۳۱.



**شێخ حوسێنی خانەقا**

ئەوەی لە نێرەدا و لە سەر ئەم بۆچوونانەی مامۆستا (محەممەد مەلا کەریم) جێگەی سەرنج بێت، بریتییە لە ئەوەی کە:

یەکەم: ئەو وەسفانەی ئیدمۆنز بۆ شێخ عەبدولکەریمی کردووە، لەگەڵ باری وێنەکەدا دێتەوە، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت، جگە لە ئەوەی هەر ئیدمۆنز خۆی ئەو وێنەیەی گرتووە، ئەوەش ڕاستە کە لە ڕووخساری شێخیشدا وێنەی پیاوێکی ٦٣ ساڵە دەرناکەوێت، بەڵام لە وێنەی کەسێکی تەمەن چل و سێ ساڵەش ناچێت!؟ چونکە هەر لە قسەکانی ئیدمۆنزدا، ئاماژە بە ئەوە دراوە کە شێخ ڕیشی ڕەنگ کردووە[1]، کاتێک دەنووسێت ((مێزەر و عابای سەرتاپا سپیی و

---

١- لە کۆندا، ڕیش ڕەنگکردن، بە خەنە یان هەر کەرەستەیەکی تر بێت، وەک نەریتێک لە لایەن پیاوانەوە بۆ خۆجوانکردن بەکارهێنراوە، هەروەک چۆن چاویان ڕشتووە و دەستیشیان لە خەنە گرتووە.

خاوێنی خانە خوێیەکەمان، لەگەڵ ڕیشی ڕەش و درێژ کە سەرە تاڵەکانی لوول بوو بوو، دیاربوو کە تازە ڕەنگی کردووە، جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ یەکتردا هەبوو. وەك پیاوچاکان، ئارام و لە سەرخۆ قسەی دەکرد. بە ڕواڵەت، کەس لە ئەو خاوێنتر نەبوو. چاوە زیتەکانی، کە شادومانییان لێدەباری، لەگەڵ جێ ددانێکی شاویلگەی خواروی، کە تازە دروستی کردبووەوە، دوو شێوەی لە یەك جیاوازیان بە ڕووخسارییەوە، دەخستە ڕوو.))[1]

دووەم: بە بەراوردکردن بە ناسنامەی حەمەسووری کڵاوقوت[2] – کە لە دواتردا بە درێژتر لە سەری دەدوێین– ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە کە چۆن ڕێی تێدەچێت شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، دوو ساڵ لە حەمەسووری کڵاوقوت منداڵتر بێت! ؟ لە کاتێکدا حەمەسووری کڵاوقوت لە ساڵی ١٨٩٠ دا لە دایك بووە و بە وتەی (مەحموود حاجی ئەحمەد بابەکر شەشۆیی[3]) لە ڕۆژگارێکدا کە حەمەسوور منداڵ بووە، شێخ بردوویەتییە لای خۆی، کاتێك دەڵێت ((وەك بۆیان باس کردووم، دوای ئەوەی کە کاك ئەحمەدە سووری[4] باوکی حەمەسوور، بە ڕووداوی کەوتنەخوارەوە لە سەر دارمازوو، کۆچی دوایی کردووە و پاش ماوەیەکیش دایکی حەمەسوور کۆچی دوایی دەکات، ئیتر "سۆفی شەریف" وەك پیاوێکی ناوداری خەڵکی شەشۆ، کە پێشتر چووەتە سووورداش و لە ئەوێ نیشتەجێ بووە، حەمەسوور بە منداڵی دەباتە سووورداش و لای خۆی دای دەنێت و پاش ماوەیەك، شێخ عەبدولکەریمی

---

١– کورد تورك عەرەب، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٥١.

٢– بڕوانە بەلگەنامەی سێیەم لە کۆتایی ئەم پەرتووکەدا.

٣– بۆ زانیاری زۆرتر لەسەر ئەم کەسایەتییە، بڕوانە بەشی دووەم، باسی سێیەم و ژیاننامەی حەمەسووری کڵاوقوت.

٤– سەبارەت بە ناوی باوکی حەمەسوور، بۆچوونی جیاواز هەیە و لە شوێنی خۆیدا ڕاستیی ناوەکە ڕوون دەکەینەوە.

شەدەڵە چاوی بە حەمەسوور دەکەوێت کە منداڵێکی زینەڵەیە، وەك شوان دەیباتە لای خۆی.))[1]

شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە ((پیاوێکی گەنم ڕەنگ، نیمچە باڵا و دەموچاو پان بووە. زانا و مەلایەکی خوێندەوار و تێگەیشتوو بووە. خوێندنی مەلایەتیی لای مەلا گەورەکانی ئەو سەردەمەی ناوچەی سلێمانیی و دەوروبەری بووە و لای مەلا عەبدوڵلای جەلیی کۆیی ئیجازەی وەرگرتووە.[2]))[3] سەبارەت بە کەسوکار و بنەماڵەی شێخ عەبدولکەریم، (عەبدوڵلا محەممەد شەریف) دەڵێت ((لە ژیانیدا، یەك جار ژنی هێناوە، واتە تەنها فەیمەخان خێزانی بووە. سێ کوڕ و سێ کچی هەبووە. کوڕەکانی ناویان: عەبدولخالق، عەبدولڕەحمان، کاکە حەمە، بووە. کچەکانیشی ناویان: فاتمە، ئایشە و خەدیجە بووە. براکانی ناویان: مامە عەبدوڵلا، مامە حەسەن، مامەحسێن، مامەسەلام و مامەڕەزا بووە[4]، کە مامەعەبدوڵلای باوکی عەلی عەسکەری، براگەورەیان بووە.))[5]

---

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (مەحموود حاجی ئەحمەد بابەکر شەشۆیی) ڕۆژی ٢٠٠٩/١/١٨، سلێمانی.

٢- محەممەد مەلا کەریم لە پەراوێزی ئەم نووسینەدا دەنووسێت: بەڵام مەلا سەلامی ترتخۆر، لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شێخ ستاردا، دەڵێت (بیستوومە لە کۆنەوە دەیخوێند. بە مەزەندە یەعنی عیبارەتی پێ دەخوێندرایەوە. ڕەنگە لە "ئەحوا" تا "جامی" و ئەوانەی خوێندبێت. لە عیبارەتی کتێبدا، عیبارەتی پێ دەخوێندرایەوە.)

٣- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی حەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٣١- ٣٢.

٤- جەمال بابان ناوی مام حسێنی نەهێناوە، بڕوانە (یاداشت نامەی ژیانم، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٨٠.)

٥- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (عەبدوڵلا محەممەد شەریف) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی. کە وێنەی ناوبراویش لە هەمان ڕۆژدا، گیراوە.



عەبدوڵلا محەممەد شەریف

لە بارەی پەیوەندی شێخ و دامەزرێنەری ڕێبازی هەقەوە، (ئێدمۆنز) دەنووسێت ((کەسێك بە ناوی "شێخ عەبدولکەریم"ی دانیشتووی شەدەڵەی نزیك بە سەرگەڵو، خزمی حاجی شێخ عارف، تەریقەتێکی سۆفیگەری بە ناوی "هەقە"وە دامەزراندبوو، یان بەرفراوانی کردبوو. دامەزراندنی ئەم تەریقەتە، بەپێی نووسراوەیەك بە ناوی "الرقصه الصوفيه"وە، لە یەکێك لە باپیرانیەوە بۆی ماوەتەوە. حاجی، لە پلەی کەسایەتییەکی گرنگی ناوچەکەدا، بەرپرس بوو، بە نهێنی بۆ ئەو تەریقەتە کاری دەکرد.))[1] ئەم ڕێبەرییکردن و پەیوەندییەی شێخ لەگەڵ خەڵکیدا، تەنها لە گۆشەنیگا ئاینییەکەیەوە نەبووە، هەروەك چۆن لە

---

١- کورد تورك عەرەب، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٥١.

پێشتردا باوبوو، بەڵکو پەیوەندییەکە ڕۆچووبووە ناو باری هەڵسوکەوتی هەمەلایەنەی ژیانی باوەڕدارانیەوە، چونکە ((شێخ عەبدولکەریم بەوە نەوەستا دوور لە باری کۆمەڵایەتی، ڕێبازی ئایین بەڕێوە بەرێ، بەڵکو بایەخی بەو ژیانە دا و تێکۆشا مریدەکانی چاکە بکەن، پاکوخاوێن بن، برایەتیان هەبێ، باش ڕابوێرن، خۆیان لە خراپ و خراپە دوور بخەنەوە، تووخنی زۆرداران نەکەون، بەربەرەکانی گشت جۆرە ستەمێك بکەن. لە ئاییندا بەکردەوە بێنە مەیدان و ئایین تەنها بریتی نەبێت لە بەندەگی ڕواڵەتی. ئەمەو سۆفییەتی کوجا مەرحەبایە، هەر بۆیە شێخ و سۆفی لە چەشنی باو، لە دژی ڕاپەڕین و وەك ڕەوشتیانە کەسێك لە قاویان بدات و فرت و فێڵیان بۆ خەڵکی ساکار ڕوون بکاتەوە، کەوتنە پیلان گێڕان بۆ کوشتنی شێخ.))[1]

لە بارەی کاری سەروو ئاسایی و توانای شێخەوە، گەلێك قسەوباس دەکرێت و دەگێڕدرێتەوە، (عەبدوڵلا محەممەد شەریف) دەڵێت ((کاتێك شێخ بۆ جاری دووەم لە حەج گەڕایەوە[2]، کەمێك درەنگتر لە حاجییەکانی تر گەڕایەوە، کەلێیان پرسی بۆچی؟ وتی: پێغەمبەر وتویەتی دوازدە ڕۆژ لە مەدینە بمێنەرەوە. ڕۆژێکیان شێخ دوای ئەوەی کە نوێژی جەماعەتی کرد، هەستایە سەرپێ و فەرمووی: عەجەبا ڕەزاشا بەڕێکەوتووە و نەگەیشتووەتە ئێرە؟! لە ئێمەش وایە مەبەستی ڕەزا شای ئێرانە! ئەوەندەی پێنەچوو، سوارێك دەرکەوت و لێمان نزیك بویەوە، کە سەیرمان کرد، بینیمان ئەو کەسە، مامەڕەزای برای شێخە. مامەڕەزا دابەزیی و دەستی شێخی ماچ کرد و برایەتیش دەوریان دا. مامەڕەزا وتی: لە

---

١- کۆمەڵناسی کوردەواری، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٢١.

٢- شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە دوو جار حەجی کردووە، یەکەمیان لە ساڵی ١٩٢٢، جاری دووەمیشیان لە ساڵی ١٩٣١دا بووە.

خەونمدا مانگ لە شانێکمەوە و خۆریش لە شانێکمەوە هەڵهات! شێخ عەبدولکەریمیش سەددەقێکی لێداو حەمد و سەلامی خوا و پێغەمبەری کرد و هاواری کرد: مام تەها... مام تەها، چایەکی برایەتیمان وەك گوێزەبانەی خەونەکەی مامەڕەزا بۆ لێبنێ. دوای ئەوە، دوو بەدوو چوونە مزگەوتەکەوە و نەهاتنە دەرەوە... هەتا دوای نوێژی نیوەڕۆ!! کە هاتنە دەرەوە، نانی نیوەڕۆیان خوارد و چوونەوە مزگەوتەکەوە و نەهاتنەوە دەرەوە... هەتا دوای نوێژی عەسر!! کە هاتنەدەرەوە، چایەکیان خواردەوە و مامەڕەزا دەستی شێخی ماچ کرد و چووەوە کەلکەسماق. چوار پێنج ڕۆژی پێنەچوو، قاچی شێخ شەهید بوو!))[1]

باوەڕبوون بە هێزی سەروو ئاسایی شێخ، بووەتە هەوێنی خوویەکی نەستیی لە لای باوەڕدارانی شێخ و کاتێك ناوی شێخ یان ئەم ڕێبازە لە لایان دەهێنرێت، ڕاستەوخۆ ڕادەچڵەکن و هەندێك جار لەگەڵ ئەم ڕاچڵەکینەیاندا وشەی (هەقە) دەدرکێنن، تەنانەت لە ئێستاشدا ئەم خووە لای چەند کەسێکی بە تەمەن ماوەتەوە! بۆ نموونە کاتێك (پووره سەوزە)مان دواند و باسی ئەوەمان لێ کرد کە ئاخۆ شێخ عەبدولکەریمی بینیوە؟ پووره سەوزە ((دەنگێکی لێوە هات و بە خۆ جوڵاندنەوە، وشەی هەقەی درکاند و پێکەنینێکیشی بۆ کرد!))[2] ئەگەرچی ئەم خووە لە ئێستادا زۆر کەم بووەتەوە و تەنها لەلای هەندێ لە بەساڵاچواندا ماوەتەوە، بەڵام ڕۆژانێك بووە خاڵی ناسینەوەی هەقەکان بووە.

---

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (عەبدوڵلا محەممەد شەریف) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی.

٢- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (سەوزە عەبدوڵلا محەممەد ئەمین) ڕۆژی ٢٠٠٨/١٢/١٧، سلێمانی، کە وێنەی ناوبراویش لە هەمان ڕۆژدا، گیراوە.



**سەوزە عەبدوڵڵا محەممەد ئەمین**

وەك لە بەشی یەکەمدا باس کرا، شێخ عەبدولکەریم، حەوتەمین کەس بووە کە لە زنجیرەکەی خۆیدا تەریقەتی درابێتێ، ئەمیش دوای ئەوەی کە تەریقەتی لە (شێخ مەلا ئەحمەدی گەڵنێری) وەرگرتووە، کە ئەم شێخەش لە ساڵی ١٩١٩دا کۆچی دوایی دەکات، دوای یەك ساڵ -واتە ساڵی ١٩٢٠- ئیدی (("شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە" دەستی بە ئیرشاد کردووە و خەڵکێکی زۆر... تەریقەتیان لە سەر دەستی وەرگرتووە.))[1] لە ئەو ساڵەوە و بۆ ماوەی بیست و دووساڵ، جگە لە ڕابەرایەتییکردنی ئیرشاد و بانگەواز بۆ ڕێبازی هەقە، کەسایەتییەکی نیشتمانپەروەر و ڕۆشنبیرێکی سەردەمەکەشی بووە.

شێخ (حوسێنی خانەقا) لە بارەی سەرەتای سەرهەڵدانی هەقەوە دەڵێت ((شێخانی هەقە، لە پێشدا وەك کۆمەڵە شێخێکی تری نەقشبەندیی، شێخێتیی و ئیرشادیان دەکرد... تا لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمدا وردە وردە لە ناو

---

١- ئاوردانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٦.

هەندێ لە مەلا و سۆفییەکاندا "شەتەحات"[١] وتن دەستی پێکرد و هەندێ لە ئەمانە، کەوتنە باسکردنی ئەوەی کە کاتی سەرهەڵدانی موحەممەدی مەهدی هاتووە و لە ئەمەشەوە و ،دە وردە کەوتنە گوێنەدان بە نوێژکردن و ڕۆژووگرتن و دەستهەڵگرتن لە ئیشوکار و شتی وا، بەڵکو بابەتی فەلسەفیی قوڵتریش.))[٢] شێخ جگە لە ئەوەی کە هەموو بنەما و مەرجەکانی ئایینی ئیسلامی جێبەجێ کردووە، ڕێگەشی لە ئەوە نەگرتووە کە بۆچوونی جیاواز هەبێت. دەتوانین بڵێین: هەر لە سەرەتای دروستبوونی ئەم ڕێبازەوە، جۆرە کرانەوەیەك لە گوزارشتکردن لە بیروبۆچووندا هەبووە. هاوکات لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرە جووتیارەی کە پشتیوانیکەری ڕێبازەکە بوون، ڕێگەیان بۆ ئینگلیز خۆش کرد کە ئەمە بکاتە بیانوویەك بۆ لێدانیان و تۆمەتی ئەوەیان بۆ هەڵبەستێت کە ئەمانە دەستی دوژمنن و بیری سۆشیالیزمیان لە پشتەوەیە، ئەمە جگە لە ئەو شەپۆلە نارەزایەتییەی کە لەلایەن دەرەبەگ و ئاغاکانی ناوچەکەوە لە سەریان بووە، بۆیە لە ساڵی ١٩٢٤دا و بەمەبەستی کز کردنی ئەم کرانەوەیە، شێخ و چەند کەسێکی ناو ڕێبازەکەی دەستگیرکرد[٣] کە سەرئەنجام ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ناوچەکە و

---

١– شەتەحات: بەو گوفتارانە دەڵێن کە لەدەمی برێ لە ئەو سۆفی مەسلەکانە دەردەچێت کە ناوەرۆك و واتا ڕواڵەتییەکەیان پێچەوانەی دەستووراتی قورئان و ئیسلامە، بەڵام وتنی ئەو جۆرە شتانە چەند هۆیەکی هەیە... بڕوانە (تەسەوف چی یە، ئەمین شێخ علادین نەقشبەندی، دار الحریة للطباعة، بەغداد، ١٩٨٥، ل١٠٩– ١١٠)

٢– ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٤.

٣– شێخ حوسەینی خانەقا دەڵێت (کە ئەم زاتانە گیران، هێشتا مەسەلەی هەقە وای لێنەهاتبوو کە ببێ بە هۆیەکی بەجێ بۆ گرتنیان، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە موتەسەریفی ئەو سەردەمەی سلێمانی "ئەحمەدبەگی تۆفیق بەگی ئابووڕئاغاسی" لەگەڵ شێخانی سەرگەڵو ناکۆکی هەبوو لە سەر موڵك، بۆیە ئەو قسەوباسانەی لێکردن بە بیانوو کە وردەوردە لە ناو خەڵکیدا لە سەریان بڵاوبووبووەوە، بۆیە بڕیاریدا بە دوورخستنەوەی شێخ عارف بۆ باشوور و شێخ عەبدولکەریم و مامەڕەزا و چەند کەسێکی

شوێنکەوتووانی هەقە، بۆ پاڵپشتیکردن و ئازادکردنی، جلوبەرگیان فڕێدا و گوێنییان کردە بەریان[1]، هەندێك لە موریدەکانی، جلەکانیان سووتاند و دەستیان لە هەموو خۆشییەکی ژیان هەڵگرت.

---

تریشی لێگرتن و ناردنییە کەرکووك تا لە ئەوێ بدرێن بە دادگا) بڕوانە (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پەراوێزی ژمارە٤٢، ل٤٣) بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت، ڕێبازی هەقە لە ئەو کاتانەدا لەبرەودا بووە، ئەو ژمارە زۆرەی کە بۆ ڕزگارکردنی شێخ، شوێن شێخ کەوتن، بەڵگەن لە سەر ئەو ڕاستییە و بە گرتنی ئەمان، هەروەك ئیدمۆنز باسی دەکات، ئەنجا ڕێبازەکە کەوتووەتە گڕی.

١- ئەم ساڵە، بە ساڵی گوێنییەکە ناسراوە. (مامۆستا جەعفەر) لە ئەم بارەیەوە کەوتووەتە هەڵەوە و لەگەڵ ساڵی ١٩٤٤دا کەمامەڕەزای تێدا گیراوە تێکەڵی کردووە. کاتێ دەنووسێت ((ساڵی ١٩٣٤دا بۆ یەکەین جار لە مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و ڕێپێوانی ئاشتیخوازانەیان بەبێ دەنگی کردووە. ئەوان هەر لە دێهاتەکانی خۆیانەوە، ژن و پیاویان لەبری جلوبەرگ، گوێنییان لەبەرکردووە بۆ ئەوەی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە لە زیندانی کەرکووك ئازاد بکەن. ڕووداوێکی تری هاوشێوە پاش گرتنی "مامەڕەزا" ڕوودەدات، دیسانەوە ژن و پیاو گوێنییان لەبەرکردووە و بەرەو کەرکووك ڕێپێوانیان کردووە.)) بڕوانە (ئیدارەی کوردی ئاستەنگ و ئاسۆی گەشەکردن، سەرچاوەی پێشوو...، ل٧١) بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ساڵی گرتنەکەی مامەڕەزا بە دارەقووڵە ناسراوە و خەڵکی داریان بەدەستەوە گرتووە و گوێنییان لەبەر نەکردووە، ئەمە جگە لە ئەوەی کە ژن لە خۆپیشاندانی ساڵی ١٩٣٤دا گوێنی لەبەر نەکردووە، هەروەك چۆن مەلا سەلامی تریخۆر لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شێخ ستاردا دەڵێت ((ژنان لە ئەم گوێنییە لەبەرکرنەدا، بەشدارنەبوون و هەر جلوبەرگی خۆیانیان لەبەردابوو.)) بڕوانە (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پەراوێزی ژمارە ٢، ل٤٤.)




**وێنەیەك لە شێوەی ئەو گوێنییەی**

**کە لە خۆپیشاندانی ساڵی ١٩٢٤دا لەبەر کراوە***

ئەگەرچی لە ژێر فشاری ئەم خۆپیشاندانە بەرفراوانەی خەڵکی ناوچەکە و موریـد و شوێنکەوتووانی هەقـەدا، شێخ ئەوەنـدە لـە زینداندا نەمایـەوە، بـەڵام زینـدانیکردنی شێخ، هۆکـارێکی زۆر کاریگـەربوو لـە بـەردەم کزبـوونی ڕێبازەکـە بەگشتیی و لاوازی توانای ڕابەرایەتیکردنی شێخ لە لایەکی ترەوە، بۆیـە ڕێبازەکـە بۆ ماوەك لاوازیی و کپی بەخۆیەوە بینی، هەروەك ئیدمۆنز دەڵێت ((تاچەند مـانگ

*- لە ڕۆژی ٢٠٠٩/١/١٩دا و لە سەردانێکدا بۆ خانەقای کەلکەسماق، شێخ هاوڕێی کوڕی کاکەحەمەی کوڕی مامەڕەزا، ئەم گوێنییەی پیشان داین کە دیار بوو ئەویش لەسەر قسەی ئەو کەسانە وێنەی گرتبوویەوە کە خۆیان بەشدارییان لە لەبەرکردنییدا کردبوو.

لەمەوبەر فیکری حکوومەتی بەخۆیەوە خەریك کردبوو.))[1]، بەڵام لە ((مانگی ئابی ساڵی ١٩٣٦دا ئەم ئابینە" هەقە" لە خرۆش کەوت.))[2]

بوونی ئەم بۆشاییە، ڕێگەخۆشکەر بوو بۆ دەرکەوتنی چەند کەسێکی یاخی لە ناو ڕێبازەکەدا، کە پێچەوانەی هەندێ ڕێوشوێنی باوەڕپێکراوی شێخ دەجوڵانەوە، بۆیە شێخ لەگەڵ"حەمەسوور"ی ڕابەری ئەم ڕێچکە یاخییەدا، کەوتە کێشەوە.



**خانەقا کۆنەکەی شەدەڵە***

---

١– کورد تورك عەرەب، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٥٢.

٢– هەمان سەرچاوە، ل٢٥٢.

*– لە کتێبی (بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە، سەرچاوەی پێشوو...)وەوە، وەرگیراوە.



**خانەقا نوێیەکەی شەدەڵە**

شێخ بە ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەر و نادیار کۆچی دوایی دەکات ((کاتێك شێخ شەوێکیان، پاش نوێژی خەوتنان، لە مزگەوتەوە بۆ ماڵەوە دەگەڕێتەوە، لە دالانی دەرگای حەوشی ماڵدا، بەردێکی تێدەگرن و بەر قاچی دەکەوێت، ئێسکی دەشکێنێ و هەر بەوە پاش چل شەو، کۆچی دوایی دەکات.))[1]، بەلام پرسیار لە ئێرەدا ئەوەیە کە ئایا دەبێت ئەو بەردە، لە لایەن چ کەسێکەوە فڕێ درابێت؟ تاچەند لە دەستی لە پشتەوە نەبووە؟ بەردێك ئەوەندە بەکارە کە بەر قاچ بکەوێت و دوای چل ڕۆژ ئەو کەسە بکوژێت؟! ئەمانە کۆمەڵێك پرسیارن و تا ئێستا وەلامیان بەنادیاری ماوەتەوە؟!

نەخۆشکەوتنی شێخ، بە ئەندازەیەك کاریگەربووە، کە شێخ نەخۆشییەکەی بە دەرد ناوبەرێت و داوای ڕزگاربوون لە ئەو دەردە بکات، کاتێك بانگی

---

١- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٣٢.

شێخەکانی دەکات و پێیان دەڵێت ((ئێوە خۆتان بە پیاو دەزانن! کوا؟ بەهەمووتان لە ئەم زیل و زیکە هیچتان پێ پاکەوە نەکرا. بەهەمووتان دەردێ بەسەر منەوە، دەردێکتان پێ سووک نەکرا.))[1]، هەروەها لە لایەن کەسانی نزیکیشیەوە ئومێدی چاکبوونەوەی لێنەکراوە و داوای ئەوەیان لێ کردووە کە وەسێتیان بۆ بکات، هەروەک (عەبدوڵلا محەمەد شەریف) دەڵێت ((کاتێک شێخ نەخۆش کەوتبوو، شێخ عارق سەرگەڵو، مامە عەبدوڵلا، مامەڕەزا و... هتد، هەموو دەوریان دا و پێیان وت: یەکێك لە شوێنی خۆت دابنێ. ئەویش فەرموی: ئیتر شێخایەتی نەما و برایەتی دادێت، ئەگەر شێخایەتی بمایە، مامەڕەزا لە من شێختر دەبوو.))[2] کە هەر ئەم نەخۆشییە بووە هۆی کۆتاییهێنان بە ژیانیی و لە ساڵی ١٩٤٢دا لە شەدەڵە کۆچی دوایی کرد.



**ئارامگەی (شێخ عەبدولکەریم) لە خانەقای شەدەڵە**

---

١- هەمان سەرچاوە، پەراوێزی ژمارە ٥، ل٤٥.

٢- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (عەبدوڵلا محەممەد شەریف) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی.

# باسی دووەم:

## مامەڕەزا



**گوندی کەلکەسماق– ناوچەی سووورداش– سلێمانی**

مامەڕەزا، برای شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەیە ((ساڵی ١٩٠٥ لە شەدەڵە لە دایك بووە. دایکی ناوی ئامینەخانە و کچی شێخ عەبدولسەمەدی قازییە. پیاوێکی گەنم ڕەنگ، سەنگین، لەسەرخۆ، قسەخۆش و ڕووناکبیر بووە. جگە لە زمانی کوردی، عەرەبیی و فارسیشی زانیوە. شارەزای مێژووی گەلەکەیی و ئەدەبیاتی کوردیی و فارسی بووە. پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ کەسایەتییە ناسراوەکانی سەردەمی خۆیدا هەبووە و گفتوگۆی لەگەڵ زۆربەیاندا کردووە.))[1] لە ژیانیدا یەك

---

١– تێڕوانینێك بۆ ڕابردووی هەشتاساڵەی گروپی هەقە، سەرچاوەی پێشوو،...، ل٢٢.

جار ژنی هێناوە و چوار[1] کوڕی بەناوەکانی: شێخ مستەفا، شێخ حەمید و شێخ محەممەد و شێخ تەها[2]وە، هەبووە.



مامەڕەزا لە ساڵی ١٩٥٣ دا*

---

١- جەمال بابان لە ناوهێنانی براکانی شێخ عەبدولکەریمدا، ناوی شێخ تەهای نەهێناوە، بڕوانە (یاداشت نامەی ژیانم، سەرچاوەی پێشوو،... ل١٨٠)

٢- شێخ تەها: کوڕی چوارەمی مامەڕەزایە و کەسێکی خوێنەوار و ڕۆشنبیربووە. ساڵی ١٩٦٣ کۆلێژی حقوقی لە بەغداد تەواوکردووە. بەشداری لە شۆڕشی ئەیلولدا کردووە و لە ناوچەکانی (خۆشناوەتی، پشدەر، مەرگە، قەرەداغ) دا وەکو حاکمی شۆڕش دەست بەکاربووە. دوای دەرچوونی بەیاننامەی یازدەی ئازاری ساڵی ١٩٧٠، کراوە بە مودیر ناحیەی بنگرد و پاش ماوەیەک گوازراوەتەوە بۆ بیارە. دوای ڕێککەوتننانەی جەزائیر، بۆ پارێزگای کەربەلا دوورخراوەتەوە. (نامەیەکی "ڕەشید محەممەد عەلی" بۆ لێکۆڵەر لە ٢٠٠٩/١١/٢٥ دا)

دوای ئـەوەی شـێخ عەبدولکـەریمی شـەدەڵە نـەخۆش دەکـەوێت و ئەگـەری مردنی نزیك دەبێتەوە، لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵی هەقەوە قسە لـە ئـەوە دەکرێت کە ئاخۆ کێ شوێنی شێخیان بۆ دەگرێتـەوە!؟ چـەند بۆچـوونێك دێتـە ئـاراوە و هەندێك پێیان وایە کە" شێخ عەبدوڵڵای براگەورەی شێخ" لە هەرکەسێکی تـر لـە پێشترە و هەندێکی تر"مامەڕەزا" و هەندێکی تر"حەمەسوور" و دەستـەیەکی تـر "حەمە ئاغا"[1] بە شایستەی شوێنگرەوەی شێخ دادەنێن... بۆ یەکلاییکردنـەوەی ئـەم باسـە، ڕوو دەکەنـە شـێخ خـۆی و پێـی دەڵـێن: کـێ شـوێنی تۆمـان بـۆ دەگرێتەوە؟ شێخیش لەوەلامدا کەس لە شوێنی خۆی دانانێت و پێـی وایـە ئەگـەر کەسێکیش دابنرێت، ئەوا کەس لە مامەڕەزا لەپێشتر نابێت!؟

ئەم وەسیێتەی شێخ، سەرەڕای ئەوەی ڕێگە بە کەس نـادات لـە شـوێنی دابنرێت، بەلام هـەر دوای کۆچـی دوایـی شـێخ عەبدولکـەیم، نەیارێتییەکـە زۆرتـر لـە نێـوان مامـەڕەزا و حەمەسـووردا چڕدەبێتەوە و هـەر یەکـەیان خۆیـان بـە شـیاوی ئـەوە دەزانـن ئەگـەر جێگـەی شـێخیش نەگرنـەوە، دەتـوانن کۆمـەڵی هەقـە ڕێنمـایی و سەرپەرشـتی بکـەن، چـونکە هـەر یەکـەیان ئەوەنـدە هـەوادارییان هـەبووە کـە داکۆکییان لێ بکات و پشتگیریان بکات، بۆ خۆشیان کەسانێکی لێهـاتوو و خـاوەن بیرێکی وەهابوون کـە بتـوانن بـەردەوامی بـە ڕێبازەکـە بـدەن و ڕێنمـایی کۆمـەڵی هەقە بکەن. سەرەنجام مامەڕەزا لە ناو ناڕەزایەتی کەمینـە و داواکاریی زۆرینـەی

---

*- ئـەم وێنەیـە لـە کتێبی (ئاوڕدانەوەیـەك لـە بزووتنـەوەی هەقـە، سەرچاوەی پێشوو....)وەوە، وەرگیراوە.

1- هەر بەهۆی ئەم کەسەوەیە کە ناوی "حەمە ئاغاییەکان دەهێنرێت" (کە زۆرتـر نیشتەجێی گونـدی "کانی تو"بوون، بەلام پاش ماوەیەکی کورت، حـەماغا وازی هێنـا و چوو بۆ سـەردانی گـۆڕی شـێخ عەبدولکەریم لە شەدەڵە و دوای گەڕانەوەی، کۆچی دوایی کرد.) بڕوانە (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنـەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، (٤٩).

هەقەکاندا، وەك کەسایەتییەکی دیار و لێهاتوو، دەبێتە جێگەی متمانەی هەقەکان و بە شێوەیەك لە شێوەکان، شوێنی شێخ دەگرێتەوە و ڕێکخستنی کۆمەڵی هەقەکان لە ڕێکخستنێکی ئایینی و تەریقەتییەوە، بۆ ڕێکخستنێکی کۆمەلایەتی، فراوان دەکات.

قسەکانی مامەڕەزا، لە ڕێکخستنی دابونەریت و جووڵانەوەی کۆمەڵی هەقەدا، کاریگەری زۆری هەبووە. بەشداریی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی مامەڕەزا، بە جۆرێك کاری لە سەر ڕێکخستنی ئایینی و کۆمەلایەتی هەقەکان داناوە، کە بتوانین کۆمەڵێك بنەما بۆ ئەم ڕێبازە دیاری بکەین و بڵێین: ڕێبازەکە ڕێچکەیەکی تری وەرگرتووە. ڕێنماییەکانی مامەڕەزا، ڕۆچووەتە ناو هەموو لایەنەکانەوە، بۆ نموونە لە نەریتی باودا چەند نەریتێکی بۆ خەڵکەکە داهێناوە کە پێشتر بوونیان نەبووە وەك ئەوەی ((پێش مامەڕەزا، شەرواڵ و مراخانی نەدەکرایەبەر، مامەڕەزا دای هێنا. لە باتی دەست ماچکردن، خوشك و برایی و یاکەریم و یاڕەزای[1] داهێنا. پێش ئەم، گۆرەوی لە پێ نەدەکرا، بەلام ئەم دای هێنا. مشکی نەدەبەسترا، تەراشی بەردەوام نەدەکرا، بەلام ئەو هەموو ئەمانەی داهێنا.))[2] هەروەها لە بواری

---

١- بریتیی بوو لە تەوەقەکردنێکی تایبەتیی و دوای ئەوەی دەستیان بەردەستی یەك کەوتووە، وتوویانە: یا کەریم و یا ڕەزا. ئەم تەوقەکە کردنە، جگە لەوەی وەك جۆرە موجامەلەیەکی سلاوکردن بەکارهێنراوە، ڕەهەندێکی تریشی ئەوە بووە کە ئیتر ئەو باسە یا کۆتایی بێت و ببڕێتەوە و هیچ پاشماوەیەکی لە دڵدا نەمێنێت. هەقەکان بەم نەریتەیان وتووە: ڕەوشت. سەبارەت بە ناوی (کەریم) و (ڕەزا)ش دوو بیروبۆچوون هەیە: یەکەمیان پێی وایە کە دوو ناون لە ناوەکانی خوا. دووەمیان پێی وایە کە کورتکراوەی ناوی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە و مامەڕەزایە.

٢- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (عەبدوڵلا محەممەد شەریف) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی.

ڕاگەیاندن و کارکردن بۆ بڵاوکردنەوە و ڕێکخستنی ڕێبازەکەدا، "براسەیارەکان"ی دامەزراند[1].

یەکێکی تر لەو داهێنانەی کە مامەڕەزا کردوویەتی، بریتیی بووە لە سەپاندنی ئابوونەی مانگانە بە سەر هەقەکاندا، کە ئەم ئابوونەیە لە ڕێگەی براسەیارەکانەوە کۆکراوەتەوەو بە ئەو کەسانە دەدراوە کە لێقەوماو بوون و پێویستیان پێی هەبووە. ڕێژەی ئابوونەکە بەپێی توانای کەسەکان بووە و بەشداریکردنیش تەنها بە پارە نەبووە، بەڵکو بە شتومەك و بەروبوومیش بووە. مامەڕەزا گرنگییەکی زۆری بە ژیانی تەندروستیی و پاکوخاوێنی داوە، بەجۆرێك لە سەر هەر کەسێکی گەورەی پێویست کردووە کە بەرگێکی خاوێنی بۆ سەفەر هەبێت، پیاوەکان تەراش بکەن و... ئەم نەریتانە بووبووە هۆکارێك بۆ ناسینەوەی هەقەکان بە ئاسانی، بۆ نموونە ئەگەر دێیەك سەد ماڵ بووبێت و سی ماڵیان هەقە بووبێت، هەستت دەکرد کە هەقەکان لە ئەوانی تر خاوێنتربوون.

---

١– ناوی "براسەیارەکان" بۆ سەردەمی مامەڕەزا دەگەڕێتەوە کە بۆ نوێنەرایەتی خۆی لە گوندەکاندا کەڵکی لە ئەم کەسانە وەرگرت. براسەیارەکان: کۆمەڵێك کەس بوون کە بە مەڵبەندەکانی هەقەدا بڵاودەبوونەوە، قسەیان بۆ خەڵکەکان دەکرد و گیروگرفتی ناوچەکانیشیان بە مەبەستی چارەسەرکردن بۆ خانەقا و لای مامەڕەزا دەهێنایەوە. کەسانێکی پاکوتەمیس بوون، پوزەوانەیان لەپێدا بووە، مشکییان بەستووە، هەموو ڕۆژێ ڕیشیان تاشیوە. دارێکی سووریان بەدەستەوە بووە، کە یا لە بەلاڵوك، یا لە هەڵوژە دروست کراوە، ئەم دارە نزیکەی مەترێك بووە. ژمارەی براسەیارەکان دە بۆ پازدە کەسێك بووە. هەڵبژاردنی ئەو کەسەی کە بووە بە براسەیار، هەروا لە خۆوە و بە ئارەزوو نەبووە، بەڵکو لە نێوان خەڵکانی هۆشیار و زمان شیریندا هەڵبژێردراون و پەسەند کراون. لە نێوان براسەیارەکان و موخلیسەکاندا، جیاوازی ئەوەیە کە (ئەوانەی بە شێوەی دوو دوو بە گوندەکاندا گەڕاون، پێیان وتراوە "براسەیارەکان"، بەڵام ئەوانەی کە لە گوندەکاندا جێگیربووبوون، پێیان وتراوە "موخلیس") بڕوانە (تاریخ تصوف در کردستان، تالیف و تحقیق: محمد رئوف توکلی، چاپ ١، ١٣٧٨، انتشارات توکلی، ٢٠٠٠، ص٢١١.)

پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریم، مامەڕەزا توانی لە ماوەی دوو ساڵدا کۆمەڵی هەقەکان لە ڕووی ڕووخسار و ناوەڕۆکەوە بەشێوەیەکی نوێتر ڕێك بخات و چوارچێوەیەکی بەرنامە ڕێژکراویان بۆ دابنێت، ئەمە لە لایەك و ئەو ناتەباییەی کە دوای کۆچی شێخ لە نێوان مامەڕەزایی و حەمەسوورییەکاندا دروست بووبوو، بوونە هۆکارێك بۆ ئەوەی کۆمەڵ و ڕێبازی هەقە ببنە جێگەی قسە و نارەزایەتی خەڵکانی دەوروپشتیان و دژایەتی بکرێن. دژایەتی هەقەکان لە سەردەمی مامەڕەزادا، لە سەر ئاستێکی بەربڵاو[1] ڕەنگی دابووەوە و دژایەتییەکە ئەوەندە

---

١– لە چەند لایەکی جیاوازەوە دژایەتی کراون وەك:

- بەشێکی زۆری ئەم جۆرە لە دژایەتی هەقەکان بۆ پشتگیری لێکردنی مامەڕەزا دەگەڕێتەوە لە ئەو کەسانەی کە نوێژیان نەکردووە. (شاکیر فەتاح) دەنووسێت ("شێخ ڕەزا"ی گەورەیان دەیوت: ئێمە ئەوسا نوێژ و ڕۆژوو و حەج دەکەین کە کردەوەی خۆمان ڕاست کردبێتەوە، ئەگینا ئێمە موسوڵمانین!) بڕوانە (ئاوێنەی ژینم، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٨٨.) (ڕەئوف محەممەد زوهدی)یش دەنووسێت ((سوفییەکی هەقەم دواند و لێم پرسی: ئێوە خاوەن تەریقەتن کەچی لە بەئەنجام گەیاندنی داب و دەستوری ئایینیدا کەمتەرخەمن، بۆیە لە گشت لایەکەوە پەلامار دەدرێن؟ کابرای هەقە گەرچی بێ سەوادیش بوو، بەڵام بەڵگە و بەهانەکەی ڕاستییەکی تێدابوو کاتێ وتی: کەسی کاکی، وەکو دەزانیت دنیا پێش قیامەت کەوتووە، لێپرسینەوە لە قیامەتدا لە سەر کردەوەی ئەم دنیایەمانە... ئەگەر لە ئێرە کردەوەمان خراپ بێت، ئیتر لە ئەوێ بەتەمای چی بین؟ ئینجا لەبابەت نوێژ و ڕۆژووەوە وتی: ئەم دوو پەیڕەوە لەنان بەسەزمان ترن؟ هەموو کەسێك پێیان دەوێرێت و دەتوانن بیکەن، گەرچی بۆ ڕواڵەت و سەرزارەکیی یان بۆ چاو بەست بێت. ئەگەر کەسێك ڕەوشت و کردەوە خراپ و بەد بێت، ناشرینە بەسەر ئەم دوو پەیڕەوەوە خۆی هەڵکێشێت، کە ئەنجامەکەی دەبێتە سوکایەتی دەربارەیان؟ چونکە ڕەوشت نزمێك دەیکات بەکورتەکی دەستیی و نان و پیازی پێوە دەخوات.)) بڕوانە (بۆ لە هەقە کەوتنە ئەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٨– ١٩)
- هەر لە ئەم بارەیەوە، (د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) دەنووسێت ((لە کۆبوونەوەیەکی نێوان (مستەفا عومەر)ی وەزیری ناوخۆی ئەو کاتانەی ئێراق و مەلاکانی سلێمانیدا، مستەفا عومەر پرسیاری ئەوەی کردبوو ئاخۆ چی بکرێت بۆ چارەسەری ئەم مەسەلەیە؟ هەندێك لە مەلاکانیش

کاریگەربووە کە ڕێگەی نەداوە ئاسۆی ڕێبازی هەقە لە ئەوە زۆرتر بەرفراوان بێت، بۆیە دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە، بەپلانێك مامەڕەزایان دەستگیر کرد و بۆ عەممارە دووریان خستەوە.

(ئیدمۆنز) ڕووداوی دەستگیر کردنەکەیمان بە ئەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە. ((ساڵی ١٩٤٤، لە نێوان شەڕی دووەمی جیهانی، ڕووداوێکی ناخۆش لە ناوچەکەدا ڕوویدا: پارێزگاری گەنجی هەولێر، بەبێ ئاگادارکردنەوەی بەغدا، یان ڕاوێژکردن بەهاوکارانی لە سلێمانی و کەرکووك کە زۆربەی ئەندامانی ئایینی هەقە لە ناوچەی ئەواندا بوون، لە پڕ مامەڕەزای جێنشینی عەبدولکەریم کە لە گوندەکەی خۆی لە کەلکەسماق، لە دامێنی ڕووبار بەلای هەولێردا دەژیا، دەستگیر کرد و ناردیە زیندانی گومان لێکراوە سیاسییەکان لە"عەممارە" لە بەشی خوارووی ...بجلە. لە ئاکامی ئەم کارە، سەدان[1] سەر لە موریدی ناوبراو، بەژن و منداڵەوە گوندەکەیان بەجێهێشت و بۆ نزیك بوونەوە لە شێخە گیراوەکەیان، سەفەرێکی پێنجسەد

---

وتبوویان: ئێوە مامەڕەزا و یەك دووانێکی تر لە سەرۆکەکانی هەقە بکەن بە دارا، ئیتر ئەوانی تر سووك سووك واز دێنن و دەگەڕێنەوە.)) بڕوانە (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل١١٢- ١١٤.)

- حکومەتی بریتانیا ئەم ڕێبازەی بە هۆکاری هۆشیارکردنەوەی خەلکیی و پتەوکردنی هەستی نیشتیمانپەروەریی و بیری پێشکەوتنخواز داناوە، هەندێك وا دەگێڕنەوە کە بریتانیا پێی وابووە ئەم ڕێبازە لە خۆڕا پەیدانەبووە و بە بیری سۆشیالیستیی بارگاوی کراوە، بۆیە لە دژی بلاوبوونەوە و تەشەسەندی دەوەستایەوە.
- لەلایەن ئەو کەسانەوەی بەرژەوەندیی و مەبەستیان لەگەڵ ڕێبازەکەدا نەدەهاتەوە، ناوونـاتۆرە و قسە بۆهەڵبەستن، شێوەیەکی باوی وەرگرتبوو.

١- لە کتێبەکەی مستەفا عەسکەریدا، ژمارەی ئەو هەقانەی کە لە (پارەلی)دا باریان خستبوو، بە دوازەهەزار کەس خەمڵێنراوە. بڕوانە (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پەراوێزی ژمارە ٢، ل٩٢.)

میلیبیان دەست پێکرد. لە نزیك کەرکووك پێشیان پێگرتن، بەڵام جگە لە ئەوەی کە هیلاکیی و ماندووبوونێکی زۆریان دیبوو، ڕێگەیان پێنەدەگیرا! تا سەرەنجام مامەڕەزایان هێنایەوە سەیمانی[1] کە جێگەیەکی باش و ئاسایی تر بوو بۆ زیارەت و چوونە لای. دوای گەڕانەوەی، چوومە لایی و چاوم پێی کەوت. پیرەپیاوێکی ئارام و لە سەرخۆ بوو. هەرچەندە ڕێنوێنییەکانی لە لایەنی ئایینییەوە هەڵبوون، بەڵام هیچ مەترسییەکی بۆ حکومەت نەبوو.))[2]

کاردانەی مامەڕەزا بەرامبەر بە دەستگیرکردنەکەی، تەنها ئەوەندەبووە کە داوای لە هەقەکان کردووە کاردانەوەی توندوتیژیان نەبێت و بەشێوەیەکی ئاشتییانە هەموو دوای کەون و داوای ڕزگارکردنی بکەن. لەژێر کاریگەری ئەم داوایەدا، ژمارەیەکی زۆر لە هەقەکان، ماڵ و موڵکیان دەفرۆشن و یەکی دارێك بەدەستەوە دەگرن و بە پێ، بۆ ئازادکردنی مامەڕەزا، بەرەو کەرکووك بەڕێ دەکەون. سەرەتا تا "یاروەلی" دەڕۆن و ماوەیەك لە ئەوێ دەمێننەوە، بەڵام سەرما زۆریان بۆ دەهێنێت و ژمارەیەکیان بە نەخۆشی کۆچی دوایی دەکات و هەر لە ئەوێ بەخاکی دەسپێرن، دوای ئەوەی گفتوگۆی ڕێگەچارە لە نێوان دەسەڵات و هەقەکاندا شکست دەهێنێت، تێکڕا بڕیار دەدەن کە بەرەو کەرکووك بکەونە ڕێ، ئەگەرچی پۆلیس ڕێگەیان لێ دەگرێت، بەڵام تا نزیك ماڵی پارێزگاری کەرکووك، لە کەرکووك، ناوەستنەوە.

شایەتحاڵێکی ئەم ڕووداوە، ڕاستی ئەم داوایەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت ((کە هاتن مامەڕەزا بگرن، ئێمە هەموو کۆبووینەوە و ئەویش پێی وتین: هیچ

---

١- شەپۆلی ئەم کۆچ و ڕەوە، لە ئەیلولی ١٩٤٤دا ڕووی داوە و سێ مانگی خایاندووە. کە دەسەڵاتداران مامەڕەزاشیان ئازادکردووە، نەیانهێشتووە تا ساڵی ١٩٤٩ بۆ کەلکەسماق بگەڕێتەوە و ڕەوانەی سلێمانیی و دواتریش هەڵەبجەیان کردووە.

٢- کرد ترك عرب، سي. جي. ادموندز، سەرچاوەی پێشوو...، ص١٨٨- ١٨٩.

نەکەن بەرامبەریان، ئەوەی منی دەوێ و بڕوای بەخوا و پێغەمبەر هەیە، با تەنها داوای ڕزگارکردنم بکات. ئێمەش لە پێناو ڕزگارکردنی، ماڵ و موڵکمان فرۆشت و شوێن مامەڕەزا کەوتین. ماوەیەکی زۆر بەڕێگاوە بووین و دواتر چووینە کەرکووک بۆ بەردەم ماڵی "لاین"، لاین وتی: دوان سیانێکتان بۆ قسەکردن بێنە ژوورەوە. مامە سەلام و مەلاسابیری سلێمانیی و یەك دووانێکی تر چوونە ژوورەوە. لاین پێی وتبوون: چیتان دەوێ بۆتان دەکەین، معاش بۆ منداڵی سەربێشکەتان دەبڕینەوە، بەڵام واز لە مامەڕەزا بهێنن. ئەوانیش وتبوویان: هیچمان ناوێت مامەڕەزا نەبێت، بۆیە پاش ماوەیەك مامەڕەزایان ئازاد کرد و ڕەوانەی هەڵەبجەیان کرد، ئێمەش بەردەوام سەردانیمان دەکرد.))[1] (جەمال بابان) وەك بینەرێکی ئەم ڕووداوە، دەنووسێت: خەڵکەکە ((ئیخلاسیان بۆ شێخەکانیان هەبوو، بینیم لە دوای دەستگیرکردنەکەی مامەڕەزا، خەڵکانێکی زۆر هاتبوونە سەر جادەکە و دانیشتبوون، هەر یەکەی شتێکی پێ بوو لە نوێن و سندوق و کەلوپەل و... دەیان فرۆشت، پرسیارمان کرد ئەوە چییە؟ وتیان ئەوە هەقەکانن، شتەکانیان دەفرۆشن و شوێن ئازادکردنی شێخەکەیان دەکەون.))[2]

---

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (عەبدوڵڵا محەممەد شەریف) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی.

٢- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (جەمال بابان) ڕۆژی ٢٠٠٩/١/٥، سلێمانی.



**وێنەیەك لە ئەو (دارە قوڵە- كوڵە) یەی كە لە خۆپیشاندانی ساڵی ١٩٤٤دا بەدەستەوە گیراوە***

سەرەڕای ڕێگریکردن لە مامەڕەزا بۆ سەفەر و دوورکەوتنەوە لە هەڵەبجە، بەڵام چونکە مامەڕەزا کەسێکی کۆمەڵایەتی بوو، هەوڵی داوە نزیکایەتی لەگەڵ خەڵکیدا پەیدابکات، بۆ نموونە (کەریم زەند) کە ماوەیەك لە هەڵەبجە لەگەڵ مامەڕەزادا بووە، دەڵێت ((ئەو کاتەی مامەڕەزا لە هەڵەبجە بوو، نزیکەی دوو مانگ بەیەکەوە لە ئوتێلێکدا بووین. دەیەویست چاوی بەشێخانی عەبابەیلیّ و بیارە بکەوێت، بۆ ئەم مەبەستە، مۆڵەتمان لە دەسەڵاتدارانی هەڵەبجە وەرگرت و

*- لە ڕۆژی ٢٠٠٩/١/١٩دا و لە سەردانێکدا بۆ خانەقای کەلکەسماق، شێخ هاوڕێی کوڕی کاکەحەمەی کوڕی مامەڕەزا، ئەم دارەی پیشان داین کە دیار بوو ئەویش لەسەر قسەی ئەو کەسانە وێنەی گرتبوویەوە کە خۆیان بەدەستیانەوە گرتبوو.

چوونە لای ئەو شێخانە. ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە پەیوەندییەکی ڕیشەیی و سۆفێتی و نەقشیتی لە نێوان ئەمان و مامەڕەزادا هەیە.))[1] یان ئاشنایەتیی و پەیوەندی هەقەکان لەگەڵ کۆماری کوردستان لە مهاباددا، هەر بۆ ئارەزووی تێکەڵی کۆمەڵایەتی مامەڕەزا دەگەڕێتەوە، هەروەها کاتێك ((کە بۆ عەمارە دوور خرابووەوە، پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ"میر حاج"دا پەیدا کردووە کە لە ئەم پەیوەندییەوە هەقەکان پەیوەندییان لەگەڵ کۆماری مەهاباددا سەری هەڵدا.))[2] و لە ساڵی ١٩٤٦، مامەڕەزا بۆ پشتیوانی لە کۆماری کوردستان لە مهاباد چەند چەکدارێك دەنێرێتە کۆمارەکە و لە ڕێی ئەم چەکدارانەوە ئاشنایەتی لە نێوان هەقەکان و قازی محەممەدیشدا دروست دەبێت. لە ئەم بارەیەوە مامۆستا (کەریم زەند) ئەو پەیوەندییەمان بەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە ((ئەو کاتەی کۆماری کوردستان لە مهاباد دامەزرا، من لە مهاباد مامۆستای دەبیر بووم، بەڕێکەوت چاوم بە "شێخ محەممەد ئەمینی مەڵحە"[3] کەوت کە مامەڕەزا لەگەڵ حەڤدە یان هەژدە چەکدارێکدا[4]، بۆ یارمەتی کۆمارەکە ناردبوونی. کە منی بینیی و بەوەی زانی کە دۆستی مامەڕەزام، زۆری پێ خۆش بوو، بەم شێوەیە، ئاشنایەتیمان لەگەڵ یەکتریدا پەیدا کرد و ئەم ئاشنایەتییەمان بۆ پێشەوا قازی محەممەد ئاشکرابوو، لەبەر ئەوە پێشەوا داوای لێ کردم تا ڕاپۆرتێکی لە بارەی هەقەکانەوە بۆ ئامادەبکەم. منیش گەڕامەوە و باسەکەم بۆ شێخ محەممەد

---

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (کەریم زەند) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/١٤، سلێمانی.

٢- تێڕوانینێك بۆ ڕابردووی هەشتا ساڵەی گروپی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٢.

٣- شێخ حەمە ئەمینی مەڵحە: ساڵی ١٨٩٤ لەگوندی سەرگەڵو لەدایك بووە. لە ساڵی ١٩٥٩دا کۆچی دوایی کردووە. لە ناو هەقەکاندا بە (وریا) ناسراوە.

٤- لە کتێبەکەی مستەفا عەسکەریدا، ئەم ژمارەیە بە ٤٠ چەکدار تۆمارکراوە. بڕوانە (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٥٥- ٥٦.)

ئەمینی مەلحە گێڕایەوە، ئەویش زۆری پێ باش بوو. لە ئەو کاتانەدا "حاجی محەممەد ئەمینی کوێرەکانی" کە پۆستەبەری نێوان شێخ محەممەدی مەلحە و مامەڕەزابوو، نامەی شێخ محەممەد ئەمینی گەیاندبووە مامەڕەزا، ئەویش جگە لە ئەوەی پەسەندی کردبوو، زانیاریشی پێدابوو.))[1]



شێخ محەممەد ئەمینی مەلحە*

هەر لە بارەی لایەنی کۆمەڵایەتیی و تێکەڵاوی مامەڕەزاوە، (جەمال بابان) ئەمەمان بۆ دەگێڕێتەوە ((لە ساڵانی ١٩٤٦-١٩٤٨دا سەردانی هەڵەبجەم کرد کە لە ئەو کاتانەدا، مامم "شەوکەت عەزمی بابان" بەڕێوەبەی ناحیەی ناوەندی هەڵەبجە بوو. لە ئەوێ، پیاوێکی ڕێکوپێکی باڵا تارادەیەک بەرز، جوان و پاک و

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (کەریم زەند) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/١٤، سلێمانی.

*- ئەم وێنەیە لە ئەرشیفی (کەریم زەند)ەوە پێشکەش بە لێکۆڵەر کراوە.

خاوێنم بینی کە لەگەڵ مامدا بەیەکەوە دەچوونە یانەیەك. منیش لەگەڵیاندا بووم و لە مامم پرسی ئەمە کێیە؟ وتی: ئەمە مامەڕەزایە و دوور خراوەتەوە بۆ ئێرە. دیاربوو پەیوەندی لەگەڵ مامدا خۆش بوو، چونکە ئەو ماوەیەی من لە ئەوێ بووم- کە نزیکەی هەفتەیەك بوو- هەموو ڕۆژێك لەگەڵ مامدا بوو، بەڵام دوای ئەوەی ڕۆژگار هات و ڕۆژگار ڕۆیشت... ئەوکاتەی بەڕێوەبەری ناحیەی میرزا ڕۆستەم بووم ١٩٥٥-١٩٥٦ و کاتێ بە دێهاتەکاندا وەك ناسین و شارەزابوونی ناوچەکە مامەڕەزام بینییەوە، وەك پێشتر نەمبینی؟ چونکە ئەو کاتە نەخۆش کەوتبوو، نزیکەی نیو سەعاتێك زۆرتر لەگەڵی مامەوە، بەداخەوە مامەڕەزا قسە خۆش و جوانەکەی هەڵەبجەی نەمابوو! شەلەل لە لایەکی دابوو و قسەی زۆر بۆ نەدەکرا...))[1] ئەوەبوو ئەم نەخۆشییە تا کۆچی دوایی لە ١٩٦١/٢/٢٥دا [illegible]اری لێ نەهێنا و دواتر کاکە حەمەی کوڕی جێگەی گرتەوە.




ئارامگەی (مامەڕەزا) لە خانەقای شەدەڵە

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (جەمال بابان) ڕۆژی ٢٠٠٩/١/٥، سلێمانی.

# باسی سێیەم:

## حەمەسووری کڵاوقوت



**گوندی کڵاوقوت– ناحیەی شوان– کەرکووک**

لە سەر بنەچە و بنەماڵەی حەمەسوور، چەند بیروبۆچوونێکی جیاواز هەیە. (عارف تەیفور) دەنووسێت ((حەمەسووری کڵاوقوت، کەسێکی نەناسراو بووە، کە بۆ شەدەڵە هاتووە، نەخوێندەوار بووە، بەڵام کەسێکی قسەزان و زمان پاراو بووە و شارەزایی تەواوی لە بوارەکانی ژیاندا هەبووە.))[1]

---

١– تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ ئەحمەدی سەرداری سەرگەڵووییەوە بەرەو حەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٢٢.



**حەمەسووری کڵاوقوت***

مامۆستا (ڕەشید محەممەد)[1] دەڵێت ((ساڵی ١٩٧٤ بۆ یەکەمجار کە حەمەسوورم بینی، لەشولارێکی دامەزراوی هەبوو، لە ئەو کاتانەدا، تەمەنی حەفتاو پێنج ساڵێك دەبوو. خەڵکی دەیان وت: ڕوسیی یان فەرەنسییە، ئەمەش لە ئەو گۆشەنیگایەوە دروست بووە، کە حەمەسوور چاوی سەوز بووە و ڕەنگی پێستی سوور و سپی بووە، بەڵام ئەم بۆچوونە ڕێی تێناچێت؟ چونکە من هەر لە خەڵکی گوندی کڵاوقوت خۆیانم بیستووە کە خەڵکی دەورووپشتی ماوەتە و یەك دوو جار، لە لای ماوەتەوە هاتوونەتە لایی و وتویانە: ئامۆزای حەمەسوورین.))[2]

---

*– ئەم وێنەیە لە ناسنامەکەیەوە وەرگیراوە، بڕوانە بەڵگەنامەی پێنجەم لە کۆتایی ئەم پەرتووکەدا.

١– مامۆستا ڕەشید محەممەد عەلی: ساڵی ١٩٤٥– ١٩٤٧ لە ناوەندی قەرەداغ لەدایك بووە. ئاشنایەتی لەگەڵ هەقەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاشنایەتییەی کە باوکی لەگەڵ هەقەکاندا هەیبووە، کە دواتریش خۆی شارەزایان بووە و تا ئێستاش هاوڕێیەتیی و دۆستایەتی لەگەڵیاندا هەر ماوە.

٢– چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی.

سەبارەت بە ناوی حەمەسوور، مامۆستا (ڕەفیق مەجید عەبدوڵڵا) دەنووسێت ((لە کاتی دادگاییکردنەکەیدا- کە لە ساڵی ١٩٥٨دا بوو- ناوی بە "محەممەد ئەحمەد بابەکر"هاتوو..، ئەمەش لە کاتێکدا تۆمار کراوە کە لەگەڵ دادوەر "موعتەسەم"ی نیشتەجێی کەرکووك، لە کێشەدا بووە...، بەڵام ئەوەی ڕاستیی بێت، کەسێکە بنەچەو ڕەچەڵەکی نادیارە. ئەوەشی کە لە سەری دەوترێت، ناگاتە باوەڕێکی تەواوەتی و ئەم گریمانانەی لە سەر هەیە: یەکەم: خەڵکی ناوچەی ماوەت-ئالان بێت. دووەم: لە ڕێگەی ڕوسیا و ئێرانەوە هاتبێتە ئێراقەوە. سێیەم: لە لایەن دادوەر "موعتەسەم"ـەوە، بەڕوسی تاوانبار کرابوو[1] و خەڵکی تریش بە ئینگلیز ناویان بردووە. بەڵام کەسێکی نزیکی هەڵنەکەوتووە کە ئەم گریمانانە بەرپەرچ بداتەوە، یان سەردانی کردبێت.))[2]. (فریاد شوانی)یش دەنووسێت ((ناوی "محەممەد ئەحمەد مەحموود"ە، بە حەمەسووری کڵاوقوت ناسراوە و لە ساڵی ١٨٧٧دا لە گوندی شەشۆی ناوچەی ماوەت لە دایکبووە))[3]. هەروەها (عەبدئەلمونعیم محەممەد) دەڵێت ((لە کاتی لێکۆڵینەوەدا دەرکەوتبوو حەمەسوور لە یەکێك لە گوندەکانی سلێمانیدا لە دایك بووە، بە فەرمی بە ئێراقی

---

١- (بەهجەت محەممەد- شاهۆ) ش لە سەر ئەم باوەڕەیە و دەنووسێت (حەمەسوور بەڕەچەڵەك خەڵکی ناوچەی ئالان و سوەیلە لە کوردستانی ڕوسیا) بڕوانە (کورتە باسێك حەمەسووری گوندی کڵاوقوت، بەهجەت محەممەد- شاهۆ، گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٢٩، ساڵی ٢٠٠٦، ل٥١.) بەڵام ئەوەی کە لە ئێرەدا جێگەی سەرنجە، ئەوەیە کە ئالان و سوەیل (سیوەیل) دوو گوندی سەر بە ماوەتن لە ناوچەی شارباژێڕ و هیچ پەیوەندییەکیان بە ڕوسیاوە نییە کە نووسەر ناوی بردوون!

٢- حركة حقة والحمسورية والاسلام الباطنية، رفيق مجيد عبدالله، مجلة جامعة دهوك، مجلد ٢، عدد١، ١٩٩٩، ص١٦٦.

٣- حەمەسووری کڵاوقوت و بزوتنەوەی حەقە، فریاد شوانی، گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٣٢، ساڵی ٢٠٠٦، ل٥٦.

دانرابوو، کە لە دایکبووی گوندی راوتی[1] سەر بە ناحیەی سووورداشە.))[2] هەرچی لە سەر گۆڕەکەشی هەیە، نووسراوە (حەمەسوور ئەحمەد)

پاش گەڕانێکی زۆر بە دوای بنەچەی بنەماڵەی حەمەسووردا، (بەختیار حەسەن کەریم)[3] گرێی ڕاستی بۆ کردینەوە و لە پوختەیەکدا بە ئەم شێوەیە باسی باپیری کرد ((ناوی تەواوەتی "حەمە عەلی ئەبوبەکر"ە و بەهۆی ئەوەی کە ڕەنگی سوور بووە، بە "حەمەسوور" ناوبانگی دەرکردووە. دایکی ناوی "حەنیفە ئەحمەد" بووە. لە ساڵی ١٨٩٠ لە دایك بووە. ئەگەرچی لە ناسنامەکەیدا شوێنی لە دایك بوونی بە "سووورداش" دیاری کراوە، بەڵام سەرچاوەی سەرهەڵدانی بنەماڵەکەی بۆ گوندی "شەشۆ"ی سەر بە ناوچەی شارباژێڕ دەگەڕێتەوە. وەك بیستوومە، لەبەر ئەوەی حەمەسوور لە تەمەنێکی زۆر کەمدا باوك و دایکی کۆچی دواییان کردووە، سەرەتا سۆفی شەریفی باوکی مەلا کەریمی سووورداش و دواتریش

١- جگە لە ئەوەی کە ناوی (راوت) هەڵەیە و مەبەست لە ناحیەی (ماوەت)ی ئێستایە، بەڵام وەك بۆمان دەرکەوتووە خەڵکی گوندی (شەشۆ) بووە نەك ماوەت.

٢- ڕۆژنامەی (الجمهوریە) ڕۆژی پێنج شەممەی مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٨.

٣- بەختیار حەسەن کەریم: کچە زای (حەمەسووری کلاوقوت)ـە. ژنی یەکەمی حەمەسوور، ناوی (حەمدیە ئەحمەد) بووە، لە ئەم ژنە، کچ و کوڕێکی بە ناوەکانی (فاتمە و عەبدوڵلا)وە هەبووە، کە ناوبراو، کوڕی کچەکەیانە، واتە حەمەسوور دەبێتە باپیری ناوبراو. کاتی خۆی (مەلا کەریمی سۆفی شەریف، داوای لە حەمەسوور کردووە کە لەبەر ئەوەی باوکی مەلاکەریم (سۆفی شەریف) حەمەسووری بەخێو کردووە، داوا لە حەمەسوور دەکات کە فاتمەی کچی بداتە کوڕەکەی مەلا کەریم کە ناوی "حەسەن"ـە، ئەویش بەقسەی دەکات و کچەکەی دەداتێ) (چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ مەحموود حاجی ئەحمەد بابەکر شەشۆیی، ڕۆژی ٢٠٠٩/١/١٨، سلێمانی) ئەمەش یەکێکی تر لە ئەو بەڵگانەی کە هەر لە منداڵییەوە حەمەسوور لە لایەن سۆفی شەریفەوە بەخێوکراوە و لە ئەم ڕێگەیەوە دەتوانین لە ڕاستی ئەوە تێبگەین کە تەمەنی حەمەسوور لە تەمەنی شێخ عەبدولکەریم گەلێك منداڵتر بووە و بە ئەمەش ئەو مێژووەی کە بۆ لە دایکبوونی شێخ دیاری کراوە، بۆمان دەردەکەوێت کە هەڵەیە. (بگەڕێوە بۆ بەشی دووەم، باسی یەکەم: شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە)

شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە بردویانەتە لای خۆیان و لە لای شێخ عەبدولکەریم، بووە بە مورید و ئیشوکاری کردووە.))[1]

حەمەسوور بە پێچەوانەی نەریتی هەقەکانەوە، زیاتر لە ژنێکی هێناوە، لە ئەم بارەیەوە (بەهجەت محەمەد-شاهۆ-) دەنووسێت ((حەمەسوور چوار ژنی هەبووە کە کچی دارودەستەکەی خۆی بوون. ژنەکانی لە جوانترین ژنی گوندەکە بوون کەس و کارەکانیان هەر بە منداڵی بە حەمەسووریان بەخشیوە و هەتا کۆچی دوایی کردووە، لەگەڵیدا ماونەتەوە.))[2] بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە حەمەسوور لە ژیانیدا، ڕاستە چەند ژنێکی هێناوە و ((ژنی یەکەمی ناوی"حەمدییە ئەحمەد" بووە و خەڵکی هەمەوەندە بووە و لە ئەم ژنە کچ و کوڕێکی بە ناوەکانی "فاتمە، عەبدوڵڵا" بووە و عەبدوڵڵا، پێش ئەوەی کە ژن بهێنێت، بە ڕووداوی "هاتوچۆ" کۆچی دوایی کردووە و فاتمەش بووە بە خێزانی کاک "حەسەن کەریم". ژنی دووەمی ناوی "بەهێ" بووە و زۆر لای نەماوەتەوە. ژنی سێیەمی ناوی "خەدیجە عەبدولڕەحمان" بووە و سەرمۆردیی بووە. ژنی چوارەمیشی ناوی"تەلحە سەید حەمید دەلۆیی" بووە و دەلۆیی بووە.))[3] بەڵام ئەم ژنانە، جگە لە ئەوەی هەر چواریان لەیەک کاتدا لەگەڵ حەمەسووردا نەژیاون (تەلحەی سەید حەمیدی دەلۆیی) خێزانی چوارەمی حەمەسوور دەڵێت ((کە حەمەسوور منی خواست، ئیتر بەهێ لە لای دانەنیشت و چووەوە بۆلای ئەو منداڵانەی کە لە پیاوێکی تر هەی بوو.))[4] هەروەها ژنی یەکەمی حەمەسوور لەدارودەستەکەی نەبووە هەروەک شاهۆ

---

١- دەستنووسێکی (بەختیار حەسەن کەریم) بە ناوی (ژیاننامەی حەمەسووری باپیرم) ٢٠٠٩، کە پێشکەش بە لێکۆڵەری کردووە.

٢- کورتە باسێك حەمەسووری گوندی کلاوقوت، سەرچاوەی پێشوو...، ل٥١ و ٥٢.

٣- دەستنووسێکی (بەختیار حەسەن کەریم) ٢٠٠٩ کە پێشکەش بە لێکۆڵەری کردووە.

٤- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (تەلحە سەید حەمیدی دەلۆیی) ڕۆژی ٢/٩/٢٠٠٩، کەرکوك.

دەیڵێت، چونکە ئەو کاتانەی کە ئەم ژنەی هێناوە، حەمەسوور جیانەبووەتەوە و داروودەستەی خۆیی نەبووە، ئەوەشی ڕاستی ئەم قسەیەمان دەسەلمێنێت ئەوەیە کە لە ئەم ژنەی منداڵی هەبووە.

یەکێکی تر لە خزم و ناسیاوانی حەمەسوور (مەحموود حاجی ئەحمەد بابەکر شەشۆیی)یە کە جگە لە ئەوەی بەشێکی زۆری وتەکاتی (بەختیار حەسەن کەریم)ی پشتڕاست کردەوە، چەند زانیارییەکی نوێشی درکاند، کاتێ وتی ((باپیرە گەورەی من کە ناوی "سۆفی عەلی"یە لەگەڵ باوکی "حەمەسوور"دا، کە ناوی "ئەحمەدە سوور"ە برای یەکن. واتە: باپیری من و حەمەسوور، ئامۆزای یەکترن. کاک ئەحمەدە سووری باوکی حەمەسوور، بە ڕووداوی کەوتنە خوارەوەی لە سەر دار مازوو کۆچی دوایی کردووە و پاش ماوەیەکیش دایکی کۆچی دوایی دەکات و حەمەسوور بە تەنها دەمێنێتەوە. سۆفی شەریف وەك پیاوێکی ناوداری خەڵکی شەشۆ، کە پێشتر چووەتە سووورداش و لە ئەوێ نیشتەجێ بووە، حەمەسووری بردووەتە سووورداش و لای خۆی داینـاوە. شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەش کە چاوی پێی کەوتووە، وەك شوان بردویەتییە لای خۆی.))[1]

سەرەڕای ناسینی بنەڕەت و بنەماڵە و شوێنی سەرەکی حەمەسوور، بەڵام لە سەر ناوی تەواوەتی حەمەسوور، دوو بیروبۆچوونی جیاواز هەیە: لە تۆماری دۆسییەی دادگاییکردنەکەیدا[2] بە (محەممەد ئەحمەد بابەکر) تۆمارکراوە، بەپێی قسەی خزمەکانیشی بێت، ناوی بە (حەمەسوور ئەحمەد) هاتووە و لە ناسنامەکەشیدا کە لە ١٩٦٢/٢/١٤دا تۆمار کراوە، بە (حەمەسوور عەلی ئەبوبەکر)

---

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (مەحموود حاجی ئەحمەد بابەکر شەشۆیی) ڕۆژی ٢٠٠٩/١/١٨، سلێمانی.

٢- بڕوانە بەڵگەنامەی چوارەم لە کۆتایی ئەم پەرتووکەدا.

نووسراوە. واتە: ئەوەی کە بەنادیاری دەمێنێتەوە، ناوی باوکییەتی، کە لە نێوان ناوەکانی (ئەحمەد) و (عەلی)دا جیاوازن و پێدەچێت هەردوو ناوەکەش یەک ناوی لێکدراوبێت.

سەرەتا حەمەسوور، وەک مورید و خزمەتکارێکی گوێڕایەڵی شێخ عەبدولکەریم جووڵاوەتەوە، بەڵام دواتر، گیانێکی یاخییانەی پڕ لە خۆشەویستیی بۆ تەریقەت و شێخ، ئاراستەی گوێڕایەڵییەکەی گۆڕیوە و دەستی بە شەتەحاتکردن کردووە. جا لەبەرئەوەشی کە ویستی حەمەسوور، ویستێکی سۆفیگەرییانەی ڕووت و بەسۆز بووە، نەیتوانیوە هاوشێوەی کەسەکانی تر و ڕۆژگاری ڕابردووی خۆی بێت، بۆیە لە بازنەی شێتەکاندا[1] کۆمەڵێک کاردانەوەی بۆ خۆشەویستی ڕێبازەکە و شێخ دەربڕیوە، کە شێخ عەبدولکەریم بە ئەم ویستەی ڕازی نەبووە و بەلادان لە ڕێباز و کۆمەڵەی هەقەی زانیوە، بۆیە ناکۆکی دەکەوێتە نێوان شێخ و حەمەسوورەوە و حەمەسوور پێش ئەوەی کە شێخ کۆچی دوایی بکات، وەک شێتێک لەگەڵ چەند شێتێکی تردا چەند هەڵسوکەوتێک دەکەن کە نەک هەر ڕەزامەندی شێخی لە سەر نەبووە[2]، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی کە شێخ بێزار بکات و تەنانەت وەک

---

١- شێت: گەرچی لە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە زاراوەکە بەچاوسەیرکردنێکی سووکە، بەڵام لەلایەنی بەرامبەرەوە، ئەوپەڕی خۆشەویستیی و تواندنەوەیە بۆ باوەڕ و ڕێی ڕاست. تەنانەت بێ بڕواکان لە کاتی خۆیدا، وتە و کردەوەکانی پێغەمبەریان (د. خ) بە وتە و کردەوەی شێت داوەتە قەڵەم و وتویانە ﴿أم يقولون به جنة بل جاءهم بالحق واكثرهم للحق كارهون﴾ (القران الكريم، سورة المؤمنون، آية ٧٠) واتە ﴿دەڵێن: پێغەمبەر شێتە؟ بەڵام ئەو هەقی بۆ هێناون و زۆربەیان ڕقیان لە هەق دەبێتەوە﴾ هەرچی حەمەسوور خۆیشی هەیە، هەقیقەتنامەکەی بە پرسیاری شێتی چییە؟ دەست پێدەکات (بڕوانە بەڵگەنامەی پێنجەم لە کۆتایی ئەم پەرتووکەدا)

٢- ڕەنگە ئەم هەڵسوکەوتانە بەشێک بێت لە ڕاستی باسی ئەو کەسانەی کە ئیدمۆنز وتەکانیانی گواستووەتەوە.

دەگێڕنەوە ((شێخ لێشی داوە و پێی وتووە: بڕۆ لە کۆڵمان بەرەوە. لە دنیاو قیامەتدا تۆ هاوڕێی ئێمە نیت و لە پۆلی ئێمە نیت.))[1]



حەسەن زێنەب*

وەك لە پێشتردا باس کرا، پاش کۆچی شێخ عەبدولکەریم، حەمەسوور وەك یەکێك لە کەسایەتییە دیارەکان، ئەگەرچی لە بنەماڵەی شێخانیش نەبووە، خۆی بە یەکەم شایستە و جێگرەوەی شێخ زانیوە و بانگەشەی ئەوەی کردووە کە جگە لە ئەم، کەسێکی تر شایستەی ئەو جێگەیە نییە، بۆیە وەك مامۆستا (هەمزە عەبدوڵڵا) دەڵێت ((پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریم، حەمە سوور مێزەرەکەی شێخ لەسەری خۆی دەنێت و جبەکەی لەبەر دەکات و بانگەشەی

---

1- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پەراوێزی ژمارە ٢، ل٤٨.

*- ئەم وێنەیە لە ئەرشیفی (عەباسی ڤیدیۆ)وە پێشکەش بە لێکۆڵەر کراوە. وەك لە وێنەکەشدا دیارە سەرپەنجەی سێ پەنجەی حەسەن زێنەب سوور بووە، کە هۆی ئەمەم لە (تەلحە)ی خێزانی حەمەسوور پرسی، وتی: ئەوە بەهۆی قەزوان لێکردنەوەوە ئەو ڕەنگەی گرتووە.

شێخێتی دەکات، بەڵام شێخەکان ملی بۆ کەچ ناکەن و لە شەدەڵە دەری دەکەن.))[1] هەر لە ئەم بارەیەوە (حەسەن زێنەب)[2] لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت ((کاتی خۆی هەموومان لە شەدەڵە پێکەوە بووین، بەڵام دوای وەفاتی شێخ، لەگەڵ مامەڕەزادا لە سەر مەسەلەی خەلافەت تێکچووین، چونکە کاتی خۆی شێخ فەرمووبووی: کەس بەخەلافەتی تەریقەت مەعزووم نییە، بەڵام ئەوان دەیانگوت: دەبێت مامەڕەزا خەلافەت بکات، بۆیە ئێمەش جیابووینەوە.))[3] دیارە ئەم قسانەش ئەوە دەردەخەن کە تا ئەو کاتانەی شێخ لە ژیاندا بووە، پەیوەندی نێوان مامەڕەزا و حەمەسوور ئاسایی بووە و بە مەرگی شێخ، پەیوەندییەک تێکدەچێت و حەمەسوور و هەوادارانی، شەدەڵە بەجێ دەهێڵن و روو لە گوندی کڵاوقوت دەکەن[4] بەڵام تێکچوونی پەیوەندی نێوانیان نەگەیشتووەتە ئاستێک کە قسە لەگەڵ یەکتریدا نەکەن و دژایەتی یەکتری بکەن، تەنانەت هاموشۆیان هەر بووە و پێیان لە یەکتری نەبڕاوە، هەروەک (پووره سەوزە)ی لایەنگرای مامەڕەزا، دەڵێت ((ئێمە باوەڕمان نەبوو کە ئەوان شێخ بن. من بۆخۆم ئەگەرچی حەمەسوورییەکانم خۆشم نەویستووە، بەڵام هەر سەردانم کردوون و ئەوانیش

---

١- ئاوڕدانەوەیەک لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پەراوێزی ژمارە ٢، ل٤٧.

٢- حەسەن زێنەب: وەک وەکیلی حەمەسوور وابووە، لەدوای حەمەسووریش، سەرپەرشتی حەمەسوورییەکانی کردووە، لە دوای ڕاپەڕین بەڕووداوی هاتوچۆ کۆچی دوایی کردووە.

٣- ئەم وتەیەی، لە ئەو چاوپێکەوتنەدا هاتووە کە لەلایەن کاک (عەباسی ڤیدیۆ)وە لەساڵی ١٩٨٦دا وێنە گیراوە.

٤- مەلا سەلامی ترێخۆر لە ئەو دیدارەیدا کە لەگەڵ شێخ ستاردا کردوویەتی، بە هەڵە باسی ڕۆیشتنی حەمەسوور و هەوادارەکانی دەگەڕێنێتەوە بۆ پێش کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریم، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەگەرچی شێخ پێشتر داوای بەجێهێشتنی شەدەڵەی لە حەمەسوور کردووە، بەڵام حەمەسوور تا کۆچی دوایی شێخ، شەدەڵەی بەجێ نەهێشتووە و هەر لە شەدەڵە ماوەتەوە. بڕوانە (ئاوڕدانەوەیەک لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پەراوێزی ژمارە ٢، ل٤٧- ٤٨.)

سەردانیان کردوین و پێمان لە یەکتری نەبڕیوە.))[1] یەکێك لە ئەو بەڵگانەشی کە لە ئەم ڕووەوە لە بەردەستدا بێت و سەلمێنەری ئەو ڕاستییە بێت کە دوای کۆچی شێخ، حەمەسوور سەردانی شەدەڵەی کردووەتەوە، ئەو چیرۆکەیە کە باس لە هاتنی خوالێخۆشبوو (مەلا مستەفای بارزان) لە ساڵی ١٩٦٧دا، بۆ شەدەڵە دەکات، کاتێ بەمەبەستی کۆبوونەوە لەگەڵیدا، حەمەسوور و حەسەن زێنەب داوەتی شەدەڵە دەکرێن و لە ئەوێ، دیدار لەگەڵ بارزانیدا سازدەدەن[2]، تەنانەت کە مامەڕەزا کۆچی دوایی دەکات، حەمەسوور بۆ پرسەکەی چووەتە کەلکەسماق

---

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (سەوزە عەبدوڵڵا محەممەد ئەمین) ڕۆژی ٢٠٠٨/١٢/١٧، سلێمانی.

٢- لە سەر ئەم دیدارە، مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) دەڵێت ((ڕۆژێکیان وەرەقەیەکی پیشاندام کە وەك بەرنامەکەیان وابوو، لەشێوەی شیعردا بوو، من بزانم لەبەریکردبوو، چونکە خوێندەواری نەبوو. لە سەر ئەمە: شتێکی بۆ گێڕامەوە: ڕۆژێکیان لە شۆڕشی ئەیلولدا، مەلا مستەفای بارزانی هاتووە بۆ شەدەڵە و ناردویانە بە دوای کەسە بەناوبانگەکاندا، تا لەگەڵی دابنیشن. یەکێك لە ئەو کەسانە، کاکە حەمەسوور دەبێت کە هاتووەتە شەدەڵە و لە دەوری حەوزێکدا و هەموو پێکەوە دانیشتوون، هەر کەسە و قسەی خۆی دەکات و حەمەسووریش ئەم وەرەقەیە دەردەهێنێت و پیشانی مەلا مستەفای دەدات، تا سەرنجی ئەو بزانێت لە سەر بەرنامەکەی؟ مەلا مستەفاش پێی وتووە: کاکە حەمە شیعری چاکە. حەمەسووریش زۆر ڕقی لە ئەم قسەیە هەستاوە- کە ئەمەی بۆ گێڕامەوە، دەیوت: توخوا ئەمە شیعرە؟!- حەمەسوور وتی: لەو چ لەیەوە "لەم جارەوە" قەرارمدا مەلا مستەفا نەبینمەوە.)) (چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ مامۆستا "ڕەشید محەممەد عەلی" ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی) هەروەها (د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) دەنووسێت ((دەڵێن: گوایە جارێك حەمەسوور چۆتە خزمەت مەلا مستەفای بەرزان، ئەویش زۆری ڕێز لێگرتووە و تاقەتی لە گوێگرتنی ئەو شتانەی حەمەسوور نەبووە کە بە "سەجع" لە بارەی بیری خۆیەوە بۆی خوێندووەتەوە، بۆیە مەلا مستەفا پێی وتووە: کاکە حەمە تاقەتی ئەم جۆرە هۆنراوانەم نییە. حەمەسوور لێی پرسیوە: مەلا مستەفا دەزانی کە نازانیت؟ بۆیە مەلا مستەفاش وتوویەتی: دەزانم کە نازانم. لە کۆتایدا حەمەسوور وتوویەتی: جەنابی مەلا مستەفا، سوپاسی دوو شتت دەکەم: یەکەمیان ئەوەیە کە ڕێزێکی زۆرت لێگرتم و دووەمیشیان ئەوەیە کە دەزانی کە نازانی.)) (دەستنووسێکی "د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ" ٢٠٠٩، کە پێشکەش بە لێکۆڵەری کردووە.)

و له پرسەکەیدا بەشداری کردووە، هەروەك (عومەر ئاشتی) وەك شایەتێك لەسەر ڕاستی ئەم بەسەرهاتە دەنووسێت ((کاتێك لەگەڵ گۆرانی شاعیردا بۆ پرسەی مامەڕەزا چووینە کەلکەسماق، لە پرسەکەیدا حەمەسوورم بینی دانیشتبوو، لێی چوومە پێشەوە و چەند پرسیارێکم لێ کرد، ئەویش هەمووی وەڵام دامەوە، بەڵام کاتێك هاتە سەر ئەوەی پرسیاری دەستگیرکردنەکەیم لێ کرد، بە پێکەنینێکەوە وتی: دیارە تۆ سیاسییت بۆیە وا وردە وردە هاتیتە سەر ئەم پرسیارە، لەبەر ئەوە وەڵامت نادەمەوە...!! ئەوەبوو وەڵامی نەدامەوە.))[1]

گوندی کڵاوقوت ((کەوتووەتە سەر ئاوی خاسە. دێیەکی خۆش بووە و خۆشییەکەشی بۆ ماندوبوونی حەمەسوور لەگەڵیدا دەگەڕێتەوە... لە ساڵی ١٩٥٦دا نزیکەی ٨٠–١٠٠ ماڵی تێدابووە... حەمەسوور لە ئەو سەردەمانەدا نزیکەی ١٠٠ موریدێکی هەبووە کە ٣٠ لە ئەم موریدانە لە کڵاوقوت ژیاون.))[2] و ژمارەیەکیش لە ئەم سی کەسە، پێکەوە لە یەك خانوودا و لەگەڵ حەمەسوور خۆیدا ژیاون. حەمەسوورییەکان، جگە لە ئەوەی زۆرترینیان لە گوندی (کڵاوقوت) نیشتەجێ بووبوون؛ لە گوندەکانی (قەرانگوێ و قۆمەرغان)یشدا موخلیسیان هەبووە. ((سەرەتا کە چوونەتە کڵاوقوت، خەڵکی کڵاوقوت بەرامبەریان وەستاونەتەوە و وایان زانیوە کە ئەمان بۆ ئەوە هاتووەن تا دێیەکەیان لێ داگیر بکەن، بەڵام دوایی بۆیان دەرکەوتووە کە حەمەسوور دڵسۆزیانە و دێیەکەی ڕاگرتووە.))[3]

---

١– نامەیەکی (عومەر عەلی سەعید موتابچی) بۆ لێکۆڵەر لە ٢٠٠٩/١٢/١ دا.

٢– کاکە حەمەی کڵاوقوت و هەندێ سەرنج و بیرەوەری، د. عەبدولستار تاهیر شەریف، گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٣٤، ساڵی ٢٠٠٧، ل١٩.

٣– چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (مەلیحە فەتحوڵلا سەعید) ڕۆژی ٢٠٠٩/٤/١٢، سلێمانی.

حەمەسوورییەکانی کلاوقوت بووبوون بە دوو دەستەوە، دەستەیەکیان بە جیا و هەریەکەیان لە خانووی خۆیدا بووە، دەستەیەکیشیان هەموو پێکەوە و لە یەک خانوودا ژیاون. ((ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە کلاوقوت و لە یەک ماڵدا لەگەڵی بوون، گەیشتووەتە پەنجاو دوو، یان پەنجا و سێ کەس.))[1] (مەلیحە فەتحوڵڵا سەعید) وەک یەکێک لە ئەو کەسانە دەڵێت ((من درەنگتر چوومە کلاوقوت، ژمارەمان لە ئەو ماڵەدا، نزیکەی سی کەسێک دەبوو. ماڵەکە سێ حەوش، چەند ژوورێك و سێ ئاودەستی هەبوو. یەکێك لە ئاودەستەکان، تایبەت بە دیوەخان بوو، یەکێکی تریان بۆ ژنان و ئەوی تریشیان بۆ پیاوان بوو. سێ ژەمە بەیەکەوە نانمان دەخوارد. دوو کابان بە ناوەکانی "ئامینە" و "فاتم"– کە فاتم هەویەی من بوو– خواردنیان لە مەنجەڵی گەورەدا بۆ دروست دەکردین. ژن بەجیا دادەنیشت و پیاویش بەجیا. خۆ ئەگەر شایی و پرسەیەك لە گوندەکەدا هەبوایە، ئەوا دەهاتن و ئەو مەنجەڵانەیان دەبرد و داوایان لە ئامینە و فاتمیش دەکرد کە خواردنیان بۆ دروست بکەن.))[2]

(ئەلحە سەید حەمیدی دەلۆیی)یش وەک یەکێکی تر لە حەمەسوورییەکان دەڵێت ((ئەو کاتانەی کە من چوومە کلاوقوت و بوومە خێزانی حەمەسوور، ژمارەمان زۆربوو، بێ لە کاکە حەمە، نۆ پیاو لە ئەو خانووەدا دەژیان، ئەوانیش: سەید نەجیم، سەید حەمید، سەید عومەر، حەمەشورتە، عەبدولڕەحمان سەرمۆردی، کاك حەسەن زێنەب، سمە عەتە، ئەحمەد فەقێ ئیسماعیل و عەبدوڵڵا

---

١– چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٢٠، سلێمانی.

٢– چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (مەلیحە فەتحوڵڵا سەعید) ڕۆژی ٢٠٠٩/٤/١٢، سلێمانی.

قوتانی بوون. هەموو خاوەن ژنی خۆیان بوون، ئەوەشی دوو ژنی هەبوایە[1]، لە دوو ژووری جویَ لە خانووەکەدا دانرابوون.))[2]



**سەید نەجیم***

---

١- ئەم قسەیەی تەلحە بەلگەیە لە سەر هەلەبوونی ئەو زانیارییەکەی کە (عارف تەیفور) دەنووسێت (موریدەکانی حەمەسوور نەدەبوو لەژنێك زۆرتریان بهێنایە) بڕوانە (تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ ئەحمەدی سەرداری سەرگەلوییەوە بەرەو حەقە، سەرچاوەی پێشوو.، ل٢٢٢)

٢- چاوپێکەوتنی لێکۆلەر لەگەل (تەلحە سەید حەمیدی دەلۆیی) ڕۆژی ٢٠٠٩/٩/٢، کەرکووك.

*- ئەم وێنەیە لە لایەن (تەلحە سەید حەمیدی دەلۆیی)ەوە پێشکەش بە لێکۆلەر کراوە.



سەید حەمید دەلۆیی *



تەلحە سەید حەمید دەلۆیی (خێزانی حەمەسوور)

*- ئەم وێنەیە لە لایەن (تەلحە سەید حەمیدی دەلۆیی)ـەوە پێشکەش بە لێکۆڵەر کراوە.



مەلیحە فەتحوڵڵا سەعید



ئامان ئیبراهیم ئەحمەد

لەبەر ئەوەی کە حەمەسوورییەکان، کۆمەڵێك ڕێسا و یاسای نوێیان پێڕەو دەکرد، ئەمانیش وەك مامەڕەزابییەکان ڕێچکەیەکی تریان بۆ ڕێبازەی هەقە هێنایە ئاراوە. بوونی چەند تایبەتمەندییەك لە هەر یەکەیاندا، هۆکارێکی دیاربوو بۆ

ناسینەوە و جیاکردنەوەی هەر یەکەیان لە ئەوی تریان. بۆ نموونە: حەمەسوورییەکان چەند تایبەتمەندییەکیان هێنایە ژیانی کۆمەڵایەتیی، ئابووریی و ئایینییەوە کە نەك هەر لە لای هەقەکان شتێکی نوێ بوو، بەڵکو لە لای تەواوی خەڵکی کوردستانیش وێنەی نەبووە؟ چونکە حەمەسوورییەکان دوای ئەوەی کە لە گوندی کلاوقوت نیشتەجێ بوون ((یەکێتییەکی زۆر پتەویان لە ناو خۆیاندا دروست کرد کە نزیکی سیستمی سۆشیالیسی بوو. لە بارەی ژیانی رۆژانە و ئەو سەروەت و ماڵەی کە هەیانبوو، هەموویان پێکەوە هاوبەش بوون و هەر کەسە بەشی خۆی هەڵگرتووە و ئەوی تری بردووە بۆ کلاوقوت بۆ ماڵی حەمەسوور. هەر کات پێویستیان بوایە، دەچوون لە ئەوێ، چییان بویستایە وەریان دەگرت.))[1] واتە: جۆرێك لە بیمەیان بۆ زامنکردنی لێقەوماوان و هەژاران دروست کردووە.

ئەگەرچی هەر لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمەوە، چەند کەسێك لە کۆمەڵەکەدا نوێژیان نەکردووە و رۆژوویان نەگرتووە، هەروەها لە سەردەمی مامەڕەزاشدا، ژمارەی ئەم جۆرە کەسانە روویان لە زۆربوون کردووە، بەڵام ئەم دیاردەیە لە لای حەمەسوورییەکان زۆرتر دەبێت و وەك تایبەتمەندییەکی رێچکەکەی لێدێت. (رەئوف محەممەد زوهدی) دەنووسێت ((سۆفییەکی هەقەم دواند و لێم پرسی: ئێوە خاوەن تەریقەتن کەچی لە بەئەنجام گەیاندنی داب و دەستوری ئایینییدا کەمتەرخەمن، بۆیە لە گشت لایەکەوە پەلامار دەدرێن؟ کابرای هەقە -گەرچی بێسەوادیش بوو- بەڵام بەڵگە و بەهانەکەی، راستییەکی تێدابوو کاتێ وتی: کەسی کاکی، وەکو دەزانیت دنیا پێش قیامەت کەوتووە، لێپرسینەوە لە قیامەتدا لە سەر کردەوەی ئەم دنیایەمانە... ئەگەر لە ئێرە،

---

١- تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ ئەحمەدی سەرداری سەرگەڵوییەوە بەرەو حەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٢٢.

کردەوەمان خراپ بێت، ئیتر لە ئەوێ، بەتەمای چی بین؟ ئینجا لە بابەت نوێژ و ڕۆژووەوە وتی: ئەم دوو پەیڕەوە لە نان بەسەزمانترن؟ هەموو کەسێك پێیان دەوێرێت و دەتوانن بیکەن، گەرچی بۆ ڕواڵەت و سەرزارەکیی یان بۆ چاوبەست بێت. ئەگەر کەسێك ڕەوشت و کردەوەی خراپ و بەد بێت، ناشرینە بەسەر ئەم دوو پەیڕەوەوە خۆی هەڵکێشێت، کە ئەنجامەکەی دەبێتە سووکایەتی دەربارەیان؟ چونکە ڕەوشت نزمێك دەیکات بە کوتەکی دەستیی و نان و پیازی پێوە دەخوات.))[1]

لە لای حەمەسوورییەکانیش، هەر کەسە و بەجۆرێك باسی هۆی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە ئایا هۆی چییە نوێژیان نەکردووە و ڕۆژوویان نەگرتووە؟ (تەلحە)ی خێزانی حەمەسوور دەڵێت ((سەرەتا نوێژیان دەکرد، بەڵام کاتێ کاکە حەمەیان لە مزگەوت دەرکرد، ئیتر نوێژکردنەکەی کزبوو. لە ئەم دواییەشدا کە هۆشی لای خۆی نەمابوو، بەتەواوی وازی لە نوێژکردن هێنا.))[2] (مەلیحە فەتحوڵلا سەعید) دەڵێت ((ئەوە ڕاست نییە کە هەموومان نوێژمان نەکردبێت، چونکە ئێمە بەردەوام و تائێستاش نوێژ و ڕۆژومان کردووە، بەڵام لە ئەم ئاخیرەدا، کە کاك حەمەیان لە مزگەوت دەرکرد و پێیان وت: تۆ کافریت، هەندێك لە پیاوەکانمان نەچوونە مزگەوت و وازیان لە نوێژکردن هێنا، کاکە حەمە خۆیشی ڕێگری کەسی نەکردووە کە نوێژ بکات، یان نەیکات.))[3]

مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) دەڵێت ((کاتێك پرسیاری ئەوەم لە حەمەسوور کرد: چۆن دەبێت کەسێك باسی خوا و پێغەمبەر بکات و ئەم

١- بۆ لە هەقە کەوتنە ئەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٨- ١٩.

٢- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (تەلحە سەید حەمیدی دەلۆیی) ڕۆژی ٢٠٠٩/٩/٢، کەرکوك.

٣- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (مەلیحە فەتحوڵلا سەعید) ڕۆژی ٢٠٠٩/٤/١٢، سلێمانی.

فەرزانەش جێبەجێ نەکات؟! حەمەسوور وتی: لەگەڵ ئەم خەڵکەدا نوێژ ناکرێت!! دیاربوو قسەی هەبوو لە سەر خەڵکەکە و لێیان ناڕازی بوو. حەمەسوورییەکان چیرۆکێکیان لە سەر هۆی نوێژنەکردنی حەمەسوور دەگێڕایەوە و دەیان وت: لە ڕۆژێکی هەینیدا حەمەسوور لە باخەکەی خۆی بەرچنەیەك هەنجیری هێنابویە بەردەم دەرگای مزگەوتەکە، بۆ ئەوەی کە نوێژکەرەکان هاتنە دەرەوە، لێی بخۆن. وەختێ پیر و پەککەوتەکان– کە هێواشتر دەگەنە بەردەم دەرگای مزگەوتەکە– دەبینن هەرچی هەنجیری نەگەیشتوو هەیە بۆیان ماوەتەوە! ڕوو دەکەنە حەمەسوور و پێی دەڵێن: توخوا ئەوە هەنجیرە؟! ئەویش وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێت: بەڵێ هەنجیر بوو، بەڵام ئێوە موسوڵمان نین؟! چونکە نەتان توانیوە گەنجەکانتان وافێربکەن کە ئاگایان لە دوای خ[illegible]یان بێت. لەبەر ئەمە، بڕیار بێت لەمە بەدواوە نوێژ نەکەم.))[1] یەکێکی تر لە ئەو چیرۆکانەی کە لە ئەم بارەیەوە باسی لێوە دەکرێت، ئەو دەمەتەقێیەی نێوان حەمەسوور و مەلا ڕەسوڵە کاتێك ((ڕۆژێکیان لە سەر ئەوەی کە بۆچی ئەم نوێژ دەکات و ئەو نایکات، لێیان دەبێت بە قسە. حەمەسور دەڵێت: ئەو قسانەی پێ ناوێت، من دەزانم کە بۆچی نوێژ ناکەم، بەڵام پرسیارێکت لێدەکەم، مەلا ڕەسوڵیش دەڵێت: فەرموو. حەمەسوور دەڵێت: ئەو کێوە کامەیە؟ مەلا ڕەسوڵیش دەڵێت: ئەوە پیرەمەگروونە. حەمەسوور دەڵێت: باشە لە ئێرەوە مێرگەپان دیارە؟ ئەویش دەڵێت: نەخێر. حەمەسوور دەڵێت: ئەی ئەگەر بڕۆیتە بەشی سەرەوەی پیرەمەگروون؟ مەلا ڕەسوڵ دەڵێت: بەڵێ مێرگەپان لە ئەوێوە دیارە.

---

١– چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی.

حەمەسووریش دەڵێت: دەی پێی ناوێت، نوێژی منیش وەك ئەمە وایە؟ چونكە منیش هەتا بەهەشتم لێدەرنەكەوێت، نوێژ ناكەم.))[1]

حەسەن زێنەب دە ێت ((ڕاستە نوێژ و ڕۆژوو لە لامان فەرزە، بەڵام تیاشماندایە نوێژ دەكات و ڕۆژووش دەگرێت، هەشمانە بەپێچەوانەوە نە نوێژ دەكات و نە ڕۆژووش دەگرێت.))[2] (مەحموود حاجی ئەحمەد بابەكر شەشۆیی) دەڵێت ((بەبیرمە كاتێ باوكم لە بارەی ئەوەوە پرسیاری لە حەمەسوور كرد كە بۆچی نوێژ ناكەن؟ حەمەسوور وەڵامی دەدایەوە و وتی: تۆ كاتێك دەتەوێت خانوویەك دروست بكەیت و كاتێ خانووەكە هاتە سەر ئەوەی پێویستی بە دارە ڕابێت، ئەمە مانای ئەوەنییە كە ئیتر پێویست ناكات دیوارەكە لە ئەوە زۆرتر بەرزبكەیتەوە؟! نوێژی ئێمەش وەهایە، ئیتر پێویست ناكات نوێژ بكەین و تەقوای ئێمە كۆتایی هاتووە.))[3]

---

١- چاوپێكەوتنی لێكۆڵەر لەگەڵ (مەحموود حاجی ئەحمەد بابەكر شەشۆیی) ڕۆژی ٢٠٠٩/١/١٨، سلێمانی.

٢- ئەم وتەیەی، لە ئەو چاوپێكەوتنەدا هاتووە كە لەلایەن كاك (عەباسی ڤیدیۆ) وە لەساڵی ١٩٨٦دا وێنە گیراوە.

٣- چاوپێكەوتنی لێكۆڵەر لەگەڵ (مەحموود حاجی ئەحمەد بابەكر شەشۆیی) ڕۆژی ٢٠٠٩/١/١٨، سلێمانی.



**حەمەسووری کڵاو قوت لە دوا مانگەکانی تەمەنیدا***

هەر لە ناو حەمەسوورییەکاندا دوو دیاردەی تری سەیر هەبووە، ئەوانیش نەخواردنەوەی چا و نەکێشانی جگەرەیە. سەبارەت بە چا نەخواردنەوە (د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) پێی وایە ئەمە دیاردەیەکی باوی ئەو سەردەمانە بووە و لە ژێر کاریگەری باری نالەباری ئابووری ئەو کاتانەدا بڕیاری لە سەر دراوە، چونکە بە باوەڕی ئەم ((ئەم دیاردەیە هەر لای حەمەسوورییەکان باو نەبووە، بەڵکو لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانیدا، شەکر و چا زۆر گران و زۆر دەگمەن بووە، زۆر کەس چایان بە خورما خواردووەتەوە. زۆر ماڵ و کەسیش بە ئەو پێیەی کە چا پێویستی ژیان نییە، بڕیاری ئەوەیان داوە کە نەیخۆنەوە،

---

*– ئەم وێنەیە لە ئەرشیفی (عەباسی ڤیدیۆ)وە پێشکەش بە لێکۆڵەر کراوە. وەك لەوێنەکەدا دیارە، شێوەی ڕیش دانان و ڕووخساری حەمەسوور وەك سۆفییەکی تەریقەتی نەقشبەندیی دەردەکەوێت؟ چونکە (سۆفیی نەقشبەندیی ڕیش ناتاشن و تەنها مووی سەر و کولم و ژێر چەناگە دەتاشن. لەبەرامبەر مورشیددا، دەست بەسینە ڕادەوەستن. لەکاتی ڕووداو و گیروگرفتدا، داوای یارمەتی لە ڕۆحی پیرانی نەقشبەندیی دەکەن. هەر شتێك لە شێخەکان بە ئەوان بگات، متفەرکە و بەڕێزەوە ناوی شێخ دەبەن) بڕوانە (کۆمەڵناسی کوردەواری، سەرچاوەی پێشوو،...، ل٢٧١)

ئەوەی حەمەسوورییەکانیش کردوویانە هەر لە ئەم گۆشەنیگایەوەیە و پەیوەندی بە حەرامبوونەوە نییە.))[1] هەروەها (حەسەن زێنەب)ی کەسی دووەمی حەمەسوورییەکانیش لە ئەم بارەیەوە دەڵێت ((چا نەخواردنەوەمان بۆ سەردەمی شێخ دەگەڕێتەوە و پەیوەندی بە گرانییەوە هەبووە.))[2]، بەڵام مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) بۆچوونێکی پێچەوانەی هەیە و دەڵێت ((هۆی چا نەخواردنەوەیان پەیوەندی بە گرانییەوە نییە؟ چونکە میوان هەرگیز لە لایان بێ چا نەبووە. بە بڕوای من هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ڕۆژێك شێخ بە برا گەورەکانی دەڵێت: موریدی من نابێت چا بخواتەوە، کاتێك حەمەسووریش گوێی لە ئەم قسەیە دەبێت، دەڵێت: من دەیخۆمەوە! شێخیش دەڵێت لەگەڵ تۆم نییە شێتە. ئیتر لە ئەو ڕۆژەوە چا لایان قەدەغە کراوە و نەخوراوەتەوە، مەگەر بۆ میوان بێت. ئەو کاتانەی کە چا بۆ میوان تێدەکرا، چایەکیش بۆ حەمەسوور خۆی تێدەکرا، ئەویش قومێکی لێدەخواردەوە و دەیوت: ئەو چایەی من بەرە بۆ فلان برا، کە زۆربەی جار بەر من دەکەوت.))[3] ئەمەش ئەوە دەردەخات کە حەمەسوور بۆ خۆی چای خواردبێتەوە، هەروەك چۆن (د. عەبدولستار تاهیر شەریف) دەنووسێت ((تەنها حەمەسوور و کوێخا حەمەی مەلاعوبێدی کلاوقوت بۆیان هەبووە چا بخۆنەوە و جگەرە بکێشن.))[4]

سەبارەت بە منداڵ نەخستنەوە لای حەمەسوورییەکان، پێش هەموو شتێك دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین کە مەبەستمان لە هەموو حەمەسوورییەکان نییە و

---

١- دەستنووسێکی (د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) ١٩٩٥ کە پێشکەش بە لێکۆڵەری کردووە.

٢- ئەم وتەیەی، لە ئەو چاوپێکەوتنەدا هاتووە کە لەلایەن کاك (عەباسی ڤیدیۆ)وە لەساڵی ١٩٨٦دا وێنە گیراوە.

٣- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی.

٤- کاکە حەمەی کلاوقوت و هەندێ سەرنج و بیرەوەری، سەرچاوەی پێشوو،...، ل١٩.

تەنها ئەوانەمان مەبەستە کە لە خانوویەکدا پێکەوە بوون، چونکە ئەوانەی کە بە جیا و لە دەرەوەی ئەم خانووەدا بوون، منداڵیان هەبووە، تەنانەت ئەوانەشی کە لە خانووەکەدا پێکەوەبوون، لە پێشتردا، یان دوای ئەوەی کە لە حەمەسوورییەکان جیابوونەتەوە، منداڵیان هەبووە، بۆ نموونە: حەمەسوور خۆی پێش ئەوەی بچێتە کڵاوقوت، لە یەکێك لە ژنەکانی، کوڕ و کچێکی هەبووە. هەر لە ئەم بارەیەوە (مەلیحە فەتحوڵڵا سەعید)[1] دەڵێت (("ئامان" پێش ئەوەی کە شوو بە حەسەن زێنەب بکات، لە پیاوەکەی تری کە ناوی "عوسمان" بووە، منداڵی بووە، چونکە عوسمان حەمەسووری نەبووە. منیش لە پیاوی دووەمم کە حەمەسووریی نەبوو، منداڵم بووە. تەنانەت عەبدوڵڵای کوڕی حەمەسووریش منداڵی هەبووە. هەروەها "سەید نەجیم"، کوڕێکی هەبووە کە ئێستا دکتۆرێکی بەناوبانگە لە سلێمانی و ناوی دکتۆر سەعیدە، بەڵام چونکە لە ئەوکاتانەدا ئەخۆشی سورێژە بڵاوبووە، منداڵ کەمتر ماوەتەوە. ئەوەش دەڵێن کە دوای ئەوەی تۆبەمان لە ناودا کراوە، ئیتر بووین بە خوشك و برای یەکتری.))[2]

---

١– لە ناو حەمەسوورییەکان لە ئەو کۆمەڵەی کە بەیەکەوە لەیەك خانوودا ژیاون، جگە لە (تەلحەی سەید حەمیدی دەلۆیی)ی خێزانی حەمەسوور، تەنها سێ ژن ماونەتەوە، کە ئێستا لە خانوویەکدا و لە ناحیەی شۆڕش دەژین، یەکەمیان (مەلیحە فەتحوڵڵا سەعید)ە کە لە تایفەی (مەلا عوبێد)ە و شووی بە (سەید عومەری دەلۆ) کردووە و پاش کۆچی دوایی سەید عومەر، شوی بە (ئەوڕەحمان سەرمۆردی) کردووەتەوە. (ئەوڕەحمان سەرمۆردی) لە ژنی پێشووی، کچێکی بە ناوی (خەدیجە)وە هەبووە و داوێنی بەحەمەسوور. دووەمیان (ئامان ئیبراهیم ئەحمەد)ە کە خەڵکی جوبلاخی لای بەحرەکەیە و ژنی دووەمی (حەسەن زێنەب) بووە، لەهەمان کاتیشدا ئامۆزای ناوبراو بووە. حەسەن زێنەب پێش ئەم، ژنێکی تریشی بە ناوی (سەفور)ەوە هەبووە. بەداخەوە لەبەر ئەوەی کە ئامان ئیبراهیم ئەحمەد گوێی گران بوو، نەمانتوانی بیدوێنین و قسەکانی تۆمار بکەین. سێیەمیان (ڕێحان حسێن مارف– حەلاو)ە کە خەڵکی قوتانە و خێزانی (عەبدوڵڵا خەلیفە عەبدوڵڵا) بووە.

٢– چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (مەلیحە فەتحوڵڵا سەعید) ڕۆژی ٢٠٠٩/٤/١٢، سلێمانی.

ئەگەرچی (حەسەن زێنەب) حاشا لە ئەوە دەکات کە ئەمان نەیانهێشتبێت منداڵیان ببێت و دەڵێت ((ئێمە ڕێگریمان لە منداڵ بوون نەکردووە، بەڵکە ڕاستییەکەی ئەوەیە: چونکە خەریکی تەریقەتین، منداڵەکانمان کە گەورەدەبن، لە لامان دانانیشن و جیادەبنەوە.))[١] بەڵام ئەم وەڵامە نامان گەیەنێتە باوەڕ و هەست دەکەین لە ئێرەدا نهێنییەك هەیە!؟ چونکە ئەوانەی لەگەڵ حەمەسووردا لە خانوویەکدا ژیاون و ژمارەیان چەند خێزانێك بووە، هیچیان نەیانهێشتووە منداڵیان ببێت و منداڵیان نەبووە!

سەبارەت بە هۆ و چۆنێتی ڕێگریکردن لە منداڵبوون، چەند بیروبۆچوونێك هەیە، لەوانە (د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) پێی وایە ((بۆیە نەیانهێشتووە منداڵیان بێت، تا ئەو پارە و بەرهەمەی ئەمان هەڵی دەسوورێنن، نەبێتە جێگەی تەماع بۆیان، بەڵام نابێت ئەوەشمان لەبیربچێت کە"رهبنة" پێڕەوی مەسیحییە و لە ئیسلامیشدا هاتووە کە **"لا رهبنة في الاسلام"** سۆفییەکانیش زۆر شتیان لە ئایینەکانی ترەوە وەرگرتووە.))[٢] (فریاد شوانی) دەنووسێت ((لە ئەم بارەیەوە، چەند جارێك لەگەڵ حەمەسووردا قسەم کردووە، ئەو دەیوت: منداڵ دەبێتە هۆی ئاژاوە، بۆیە ئێمە منداڵ قەدەغە دەکەین.))[٣] مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی)یش دەڵێت ((لە سەر ئەم باسە، حەمەسوور پاساوی بەو ئایەتە دەهێنایەوە کە دەفەرموێت **﴿واعلموا أنما اموالكم و أولادكم فتنة وأن الله عنده أجر عظيم﴾**[٤])) [١] بەڵام (عارف تەیفور) پێی وایە کە ((فەلسەفەی حەمەسوور بۆ

---

١- ئەم وتەیەی، لە ئەو چاوپێکەوتنەدا هاتووە کە لەلایەن کاك (عەباسی ڤیدیۆ)وە لەساڵی ١٩٨٦دا وێنە گیراوە.

٢- دەستنووسێکی (د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) ١٩٩٥ کە پێشکەش بە لێکۆڵەری کردووە.

٣- حەمەسووری کڵاوقوت و بزوتنەوەی حەقە، سەرچاوەی پێشوو،...، ل٥٦.

٤- القران الكريم، سورة الانفال، آية ٢٨.

قەدەغەکردنی منداڵ بوون ئەوەیە: کە منداڵ وەک کوتە گۆشتێک وایە و لە گرفت و ئازار و دەردەسەری بەولاوە، هیچی تری تووش نابێت، بۆیە مرۆڤ منداڵی نەبێت چاکترە.))[2]

دەتوانین بڵێین: ویستی منداڵ نەبوون لای حەمەسوورییەکان بۆ مەیلی پیاوەکانیان بگەڕێنینەوە، چونکە ژنەکانیان ویستوویانە و مەیلی ئەوەیان هەبووە کە منداڵیان هەبێت. (تەلحە سەید حەمید دەلۆیی) لە ئەم بارەیەوە دەڵێت ((من حەزم لە منداڵ بوو، بەڵام چونکە دەمزانی کە کاکە حەمە حەزی لێ ناکات، نەمدەدایە ڕووی. هیچ دەرمان و شتێکیشمان نەخواردووە کە نەهێڵێت منداڵمان ببێت. کاکە حەمە دەی وت: ڕۆژێ دێت لە سەر ئەوەی کە نەمان هێشتووە منداڵمان ببێت، خەڵکی ئافەرینمان دەکەن، ئیتر نازانم چۆن منداڵمان نەبووە!؟ ژنێکمان عەمەلیات بوو، دەمانزانی لەبەر عەمەلیاتەکەیەتی منداڵی نابێت. ئەو کاتەی من شووم بە حەمەسوور کرد، ژمارەی ئەو ژنانەی کە لە ئەو ماڵەدا پێکەوە دەژیاین، چواردە ژن بووین، کەسمان منداڵمان نەبوو، ئەگەرچی تێماندا هەبوو کە پێشتر منداڵی هەبوو، واتە: لە پیاوێکی تر کە حەمەسووری نەبوون، بۆ نموونە: کاکە حەمە خۆی لە ژنی یەکەمی منداڵی بووە. بەلقیسی ژنی سەید نەجیم، لە پیاوێکی تر منداڵی هەبووە، ئامانی ژنی حەسەن زێنەب، لە پیاوەکەی تری کە ناوی "عوسمان" بووە و حەمەسووری نەبووە، منداڵی بووە....))[3]

مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) دەڵێت ((جارێکیان پێشمەرگەیەکی برادەرم پێی وتم: بەشکو بە کاکە حەمە بڵێی کە چۆن وادەکەن منداڵیان نەبێت!؟ وتم:

---

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٢٠، سلێمانی.

٢- تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ ئەحمەدی سەرداری سەرگەڵووییەوە بەرەو حەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٢٢.

٣- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (تەلحە سەید حەمیدی دەلۆیی) ڕۆژی ٢٠٠٩/٩/٢، کەرکووک.

باشە و ئەم پرسیارەم لە کاکە حەمەسوور کرد، ئەویش لە وەڵامدا وتی: ئەم دەشتی ناوشوانە چەند بە بەرەکەتە، ساڵ دوازدەی مانگ گاسنی لێ دە، گەر تۆوی پێوەنەکەیت، ئایا هیچت لێ دەست دەکەوێت؟! هەروەها لەبیرمە جارێکیشیان دانیشتبووین و باسی منداڵ و ئەوانەمان دەکرد، لە ئەوکاتانەدا منداڵێك لە دیوی حەوشەکەوە هاتە بەرچاومان، منیش سەیرێکم کرد و وەك پرسیار لە لام کەوتەوە کە ئەی ئەم منداڵە چییە ئەگەر منداڵیان نابێت؟! حەمەسووریش لە سەیرکردنەکەم گەیشت و وتی: مەلا، ئەمە هی برایەکی وەیە و لای ئێمە بەجێی هێشتووە، زۆر مەمنوون دەبم ئەگەر پێی بڵێیت کە بێت بیباتەوە؟ وتم: بۆچی کاکە حەمە، بۆتان بەخێو ناکرێت؟! بەتوڕەبوونەوە وتی: ژن بێ ئەقڵە، کە دەچمە ژوورەوە، دەبینم ژنەکان خۆشیان دەوێ و دەیکەنە باوەش نەکا ئارەزووی منداڵیان لا دروست بێت، ئەگینا وەعد بێت تا پێنج ساڵی تر، ئازوقە و نانیان لە سەر من بێت.))[1] لە ئەمەوە دەردەکەوێت کە پیاوەکان ڕێگریان لە منداڵبوون گرتووە و نەیان ویستووە کە منداڵیان ببێت و ڕەنگە ئەمەشیان لە ڕێگەی بەستنی سروشتی (منع طبیعي)ـەوە کردبێت کە دیسانەوە ئەمەش جێی پرسیارە چۆن توانیویانە ئەمە بکەن؟!

سەبارەت بەکار و بژێوی ژیانیان، هەر دوای ئەوەی حەمەسوور ڕوودەکاتە گوندی کلاوقوت، چەند دۆنمێك زەوی دەکرێت و دەست بە چاندنی گەنم و جۆ دەکات و لە گوندەکانی سەرگەڵو و بەرگەڵووەوە، نەمامی بەردار دەهێنێت و دەینێژێت، هەروەها ((لە کەنار دێیەکەدا، جگە لە بەخێوکردنی مێش هەنگوین، لە سەر ئاوی خاسە ڕەزەترێ، هەنجیر، قەیسیی و هەندێ جۆر دارەبەری باشی

---

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی.

ڕواندووه.))[1] و (سەید عومەر) لە ناو حەمەسوورییەکاندا وەك کار دابەشکەر ناسێنراوە و کەسەکانی بۆ کاری ناومالّ، سەر زەوی کشتوکالّیی، لای ئاژەلّەکان، فرۆشتنی بەروبووم و کاری دەستیان لە بازاڕدا، دیاری کردووە. مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) دەلّێت ((ئیش لای حەمەسوورییەکان زۆر گرنگ بوو، بە کاری ئاژەلّداریی و کشتوکالّ و تەزبیح دروستکردنەوە خەریك بوون. کارەکانیان دابەش دەکرد. من خۆم کاکەحەمەم بینیوە کە جووتێ جزمەی سووری لە پێدابووە و خاکەنازی بەسەرشانەوە بووە و بەرەو ئیشکردن ڕۆیشتووە.))[2]

(حەسەن زێنەب) سەبارەت بە سەرچاوەی بژێوییان دەلّێت ((کاری جووتیاریی و قەزوانکردن دەکەین، بەرهەمی کەسابەتەکەشمان دابەش دەکەین و هەموومان بەیەکەوە نان دەخۆین.))[3] حەمەسوور لە پێش هەموویانەوە کاری کردووە و خۆی بووە بە وێنەیەکی لەبەرچاو بۆ کەسانی چواردەوری، هەروەك خۆیان دەلّێن ((کاك حەمە بەردەوام ئیشی دەکرد، بە ئەندازەی دوو پیاو ئیشی دەکرد، بەردەوام تەور و تەورداسی بەدەستەوەبوو. بەهۆی ئیشەوە، قاچی قلّیشابوو، شەوانە مەرهەمێکی ڕەشی هەبوو، تێی هەلّدەسوو.))[4]

لە ئەم زانیارییانەی سەرەوە ئەوە دەردەکەوێت کە حەمەسووری کلّاوقوت، هەر لە دوای ئەوەی کە هەستی کردووە لەگەلّ شێخدا نایەتەوە و ناتوانێت لە شەدەلّە بمێنێتەوە، ئیتر بە پێی بەرنامەیەك کە خۆی بە ڕێکخەر و پێشەوای داناوە، هەولّی داوە مەیلی چەند کەسانێك لەدوای خۆی بخات و ڕوو لە کلّاوقوت

---

١- کاکە حەمەی کلّاوقوت و هەندێ سەرنج و بیرەوەری، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٩.

٢- چاوپێکەوتنی لێکۆلەر لەگەلّ مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی.

٣- ئەم وتەیەی، لە ئەو چاوپێکەوتنەدا هاتووە کە لەلایەن کاك (عەباسی ڤیدیۆ)وە لەسالّی ١٩٨٦دا وێنە گیراوە.

٤- چاوپێکەوتنی لێکۆلەر لەگەلّ (مەلیحە فەتحوللا سەعید) ڕۆژی ٢٠٠٩/٤/١٢، سلێمانی.

بکات. بەرنامەکەی حەمەسوور، زۆرتر لە بەرنامەی دەستەیەکی سیاسیی چووە. بۆیە بەتەنیشت نارەزایەتی ئایینییەوە، نارەزایەتییەکی سیاسیشی بەرامبەر بووەتەوە، بەڵام بە میانڕەوییەکی زۆرەوە، هەوڵی داوە یاخی بوونێکی گەورە بە بەرامبەربوونەوەیەکی کەم، کۆتایی پێ بهێنێت، سەرەنجامیش هەروابووە و تا ئەوکاتەی لە ساڵی ١٩٨٥دا نەخۆش دەکەوێت و لە ڕۆژی ١٩٨٦/١٢/٤دا کۆچی دوایی دەکات، دەیان ڕووبەڕووبوونەوەی گەورەی چارەسەرکردووە، کە هەندێکیان لە مەرگی خۆی گەڕاوەتەوە.



**حەمەسووری کڵاوقوت و چەند مامۆستایەکی گوندی ڕێدار***

*- ئەم وێنەیە لە ساڵی ١٩٧٦دا گیراوە و لە (ئەرشیفی: جەلیل محەممەد شەریف)ـەوە دەست کەوتووە.

# بەشی سێیەم

## باسی یەکەم:

جیهانبینی بیری هەقە

## باسی دووەم:

پەیوەندی هەقە و ئەهلی هەق

## باسی سێیەم:

پەیوەندی هەقە و بەهائییەکان

## باسی چوارەم:

بەربەرەکانێکردنی هەقەکان

## باسی یەکەم:

### جیهانبینی بیری هەقە

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك پێیان وایە جیهانبینی هەقە کاریگەری جیهانبینییەکی تری لە سەرە، وەك: رێبازی مەزدەکی[1] یان بیری (ناتوندوتیژی)ی غاندی، هەروەك (محەمەد مەلا کەریم) لە هەڵوێستی هەلگرتنی دارەقوڵەیاندا دەنووسێت ((جێ پەنجەی رێبازی "بێ زۆر- لاعنف"ی غاندی... بەئاشکرا بە ئەم هەڵوێستەی هەقەکانەوە دیارە.))[2] یان بەشێوەیەك لە شێوەکان لە قرمتییەکان دەچن، هەروەك (د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ) دەنووسێت ((رەنگە شێخ عارف و شێخ عەبدولکەریم وەك خوێندەوارێکی بەئاگا لە کتێبەکانی مێژووی ئیسلامەوە ئاگاداری شۆرشی قرمتی، بابەکی و زنج بووبن، بەتایبەت حەمەسوورییەکان کە زۆر شتیان لە قرمتییەکان دەچێت.))[3] تەنانەت بە زیندووکەرەوەی بیروباوەرێکی

---

١- ((بزووتنەوەی مەزدەکی، کە لە سەدەی پێنجەمی زاینییدا لەدژی رژێمە چینایەتییە کۆمەلایەتیی و ئابوورییە توندوتیژ و حوکمەکەی دەوڵەتی زەردەشتی -دینی فارسە ساسانییەکان- سەری دەرهێنا... بروای بنەرەتی بە یەکسانی کۆمەلایەتی خەلکی هەبوو کە ئائێستاش بەشێوەیەکی دیار لای تایفەی یەزدانیدا باوە. مەزدەك بانگەشەی بۆ بە گشتییکردنی موڵك و ماڵی مادی کرد و ئەوەی خراوەتە پاڵ کە ئافرەتانی خستووەتە پاڵ ئەو موڵك و ماڵانەوە. گوناهی تێکەڵبوونی سێکسی تا ئەمرۆ بە تەوێلی تایفەی یەزدانییەوەیە. بە گشتییکردنی موڵك و سامان، زۆر نووسەری ئەم سەردەمەی هانداوە کەوا ئەم تایفەیە بناسێنن کە یەکەم سیستەمی کۆمۆنیستییان لەجیهاندا لێکەوتووەتەوە.)) بڕوانە (ئاین و تایفە ئاینییەکان لە کوردستان، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٦- ٢٧.)

٢- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٩٢.

٣- دەستنووسێکی (د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ) ١٩٩٥، کە پێشکەش بە لێکۆڵەری کردووە.

لە پێشتری دەزانن و دەنووسرێت ((نەقشبەندییەکانی سەرگەڵو لە کوردستاندا، ئایینی پەردیوەرییان لە ژێر ناوی "هەقە"دا لە ناو خۆیاندا زیندووکردووەتەوە.))[1]

هەر یەکە لە ئەم تێڕوانینانە، بابەتی سەربەخۆن و بۆ ئەوەدەشێن لێکۆڵینەوەی زۆریان لە سەر بکرێت، بەڵام ئەوەندەی پەیوەندی بە ئەم باسەوە هەبێت، دەتوانین بڵێین: سەرچاوە و جیهانبینیی بیری هەقە، بە پلەی یەکەم بۆ بیری سۆفیزمی ئیسلامیی و گۆشەنیگای جیاوازی تەریقەتی نەقشبەندیی دەگەڕێتەوە، هەروەك چۆن بیری سۆفیزم خۆی نیشانەی دەرکەوتنی فیکر و قۆناغێکی نوێیە لە هەناوی ئیسلامدا، بەهەمان شێوەش بیری هەقە دەرهاویشتەی جیهانبینییەکی نوێ بوو لە تەریقەتی نەقشبەندیی و سۆفیزمدا، چونکە وەك چۆن سۆفیزم ((لە ژێر کاریگەری گۆڕانی سیاسی- کۆمەڵایەتی- ئابوورییدا، دەکەوێتە بەردەم چەند ڕێگە و شێوازێکی جیاجیای ترەوە کە بە تەریقەت ناودەبرێت و ئاسۆی ڕێبازی خۆڕاهێنانیان بۆ خواپەرستیی و پاککردنەوەی دەروون و شێوەی گەیشتنیان بە هەقیقەت و ڕاستی جیاوازە، بە ئەم جۆرەش لە دەرهاویشتەی یەکێك لە ئەم ڕێبازانەدا "نەقشبەندیی" کۆمەڵی هەقە بەلادانێکی ترو ڕێبازێکی تر کە هەر لە سۆفیزمەوە سەرچاوە دەگرێت، ڕێگەیەکی تری دۆزییەوە، کە ئەمجارەیان ڕێگەکە هەر سەفەر نەبوو بۆ هەقیقەتێك کە لە بوونی خوا و چییەتییە ئایینییەکەیەوە هاتبێت، بەڵکو سەفەرێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری گەورەتربوو لە ئەوەی کە بە تەنها لە ئەو کاتانەدا لە ناو گۆشەنیگای بیرکردنەوە ئایینییە باوەکەدا هەبوو.))[2] بۆیە دەتوانین بڵێین: جیهانبینی بیری هەقە لەگەڵ کۆمەڵێك

---

١- ڕاپەڕینی عەلەویەکانی زاگرۆس یا لێکۆڵینەیەکی مێژوویی لە سەر ئەهلی حەق، سەرچاوەی پێشوو...، ل٣١- ٣٢.

٢- ڕەوشی ئاینی و نەتەوەیی لەکوردستاندا، ڕەشاد میران، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری برایەتی، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٦٥.

تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی، ئابووریی و سیاسی سەردەم و ناوچەکەدا، لە هەناوی بیری سۆفیزم و تەریقەتی نەقشبەندییەوە، لە دایك بووە.

هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، مێژوویی و ناوچەیی سەردەم، لە ئاراستەکردن و دامەزراندنی هەر بیروباوەڕێکدا، ڕۆڵی کاریگەریان هەیە. بۆ نموونە: ئەگەرچی هەر یەك لە جیهانبینی (هەقە، بارزان و نورجوو) بۆ بیری نەقشبەندیی دەگەڕێنەوە، بەڵام هەر یەك لە ئەمانیش، هەڵقوڵاوی هەلومەرجێکن کە ژینگەی لە باری سەرهەڵدانیان بووە. هەروەك چۆن ((چ دیاردەی هەقە و چ نەریتی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی بەرزان[1]، بۆ شەخسی مەولانا خالید و ئەو جۆرە "نەقشبەندێتی"یەی کە ئەو هێنایە ئاراوە دەگەڕێنەوە، بەڵام پرسیار ئەوەیە بۆ هەر لە ئەم دوو شوێنە نەقشبەندیی وا ڕۆیشت و لە شوێنی تردا وانەبوو!؟ یان بۆچی هەندێکی تر لە ئەوان ڕێگەی شۆڕشیان گرت و هەندێك ڕێگەی ئاشتیخوازانەیان گرت!؟ ئەمە پەیوەندی بە باری کۆمەڵایەتیی و جوگرافی ناوچەکەوە هەیە و بە ئەمەش، لایەنە فیکرییەکەی لێك دەدرێتەوە.))[2] هەروەها بزووتنەوەی (نورجوو) لەگەڵ ئەوەشدا کە چاوگەکەی هەر کوردستانە و بیرەکەشی هەر بۆ تەریقەتی نەقشبەندیی دەگەڕێتەوە، بەڵام لێرەدا پرسیار ئەوەیە کەئایا بۆچی ئەم بزووتنەوەیە لە زەمینەی کوردستانی تورکیادا دەرکەوت و لە کوردستانی ئێراقدا دەرنەکەوت!؟ ئایا ئەو هۆکارانەی کە ئەم بزووتنەوەیە بۆ سەرنجڕاکێشانی خەڵکی گرتنییە بەر،

---

١- (مارتین ڤان برونەسن) دەنووسێت ((هەندێ لە شێخان دنەی مەیل و ئارەزووی لەڕێ لادانی لایەنگرانیان دەدەن، هەتا شێخ بارزان گوایە ڕێگەی زێدەڕەویی و لەڕاستەڕێ لادان و بانگەشەی مەهدێتی، خوایەتی، گۆشتی بەراز خواردن و هەتا پەرەپەرەکردنی قورئانیشیان داوە.)) بڕوانە (ئاغا و شێخ و دەوڵەت، مارتین ڤان برونەسن، وەرگێڕانی: د. کوردۆ عەلی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٧٨.)

٢- دەستنووسێکی (د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) ١٩٩٥ کە پێشکەش بە لێکۆڵەری کردووە.

وەك ((شەیدایانی عیرفان، بەهۆی جۆری تێڕوانینی عیرفانانەوە و لە ڕوانگەی ڕیسالەی نوورەوە. ڕۆشنبیرانی ئایین پەروەر، بەهۆی دید و بۆچوونی چاکی بزووتنەوەکەوە بەرامبەر زانستی نوێ و سەردەم. نیشتیمان پەروەرانی کورد، بەهۆی هەڵوێستی کورد پەروەرانەی کۆنینەی سەعید نوورسی خۆیەوە. کۆنەخوازان، بەهۆی بیری دژە کۆمۆنیستانەی بزووتنەوەکەوە.))[1] هەر هەمان ئەو هۆکارانە بوون کە لای هەقە هەبوون؟ بێگومان نەخێر.

جیاوازی نەکردن لە نێوان قۆناغ و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی کۆمەڵی هەقەدا، لێکۆڵەر زۆر بەئاگا نەبێت، دەکەوێتە هەڵەوە، وەك چۆن (مارتین فان برونەسن) تێی کەوتووە، کاتێك دەنووسێت ((شێخی نەقشبەندیی کە شێخ ئەحمەدی سەرگەڵووە[2]، ڕێبازێکی جوداکردۆتەوە، لە تەریقەتەکە لایداوە و لە هەندێ گوندی کوردستانی ئێراقدا جۆرە سیستمێکی کۆمۆنیستی سەرەتاییانەی دامەزراندووە.))[3] کە دیارە لە ئێرەدا جگە لە ئەوەی جیاوازی لە نێوان دوو قۆناغدا نەکردووە کە نزیکەی یەك سەدە لە یەکترەوە دوورن، ئەویش ماوەی نێوان شێخ ئەحمەدی سەردار و شێخ عەبدولکەریمە، هەروەها جیاوازیشی لە نێوان جۆری لادانی هەر یەك لە شێخ ئەحمەدی سەردار و شێخ عەبدولکەریمدا نەکردووە.

---

١- ئاغا و شێخ و دەوڵەت، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٢٢.

٢- ڕاستە (شێخ ئەحمەدی سەرگەڵو) شێخی تەریقەتی نەقشبەندییە، بەڵام ئەم شێخە سیستمێکی کۆمۆنیستی سەرەتاییانەی دانەمەزراندووە، بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەیە کە شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، دامەزرێنەری ئەو ڕێبازەیە کە بە سیستمێکی کۆمۆنیستی سەرەتاییانە چەند کەسێك ناوی دەبەن.

٣- ئاغا و شێخ و دەوڵەت، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٧٨.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بیری کۆمەڵی هەقە بۆ دوو قۆناغ دابەش بکەین کە ئەوانیش قۆناغی سەرکردایەتی ئەم بیرەیە لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەدا و دووەمیش قۆناغی دوای کۆچی دوایی شێخە کە دەکرێت بە قۆناغی ڕیفۆرمی بیری کۆمەڵی هەقەکانی ناوبەرین، چونکە پاش کۆچی دوایی شێخ، هەر یەك لە مامەڕەزا و حەمەسووری کڵاوقوت، ئاراستەی بیری هەقەیان ئاوێتەی هەلومەرجی نوێی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسی نوێ کرد و دوو ڕێچکەی جیاوازیان لە ڕێباز و بیری هەقەدا پەیدا کرد، کە هەر یەکەیان خاوەنی چەند تایبەتمەندییەکن و بۆ لە چوارچێوەگرتنی ئەم تایبەتمەندییانە و دابەشکردنیان بە سەر هەریەك لە ئەم کەسایەتییانەدا، پوختەی بەرنامەکانیان لە دوو قۆناغدا دەخەینەڕوو:




خانەقای کەلکەسماق

## قۆناغی یەکەم (١٩٢٠-١٩٤٢)

ئەم قۆناغە، سەردەمی ڕابەرایەتی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە دەگرێتەوە و دەتوانین پوختەی بەرنامەکەی، لەچەند بنەمایەکدا کورت بکەینەوە کە ئەمانەن:

**١- هەقپەروەریی:**

یەکەمین بنەمای کۆکەرەوەی ئەندامانی کۆمەڵی هەقەیە. لەسەر هەر یەك لە ئەندامانی کۆمەڵی هەقە، پێویست بووە کە لایەنی هەق بگرن و لە ناهەقی دوورکەونەوە، با ئەم لایەنگریی و دوورکەوتنەوەیەش لە بەرژەوەندیشیاندا نەبێت، چونکە ڕێبازی هەقە خوا بە یەکەمین هەق دادەنێت و دەبێت هەموو هەقیقەتەکانی تری وەك (دادوەری، ڕاستگۆیی، هاوبەشی، یەکسانی، برایەتی...) ملکەچی ئەم هەقیقەتە گەورەیە بن و لە سایەیدا ناهەقی نەکرێت.

ڕێبازی هەقە، هەقیقەت بەتەنیشت هەر یەك لە (شەریعەت، تەریقەت، مەعریفەت)ـەوە، بە پایەیەکی گرنگی خواناسی دەزانێت و پێویستە ئەندامانی کۆمەڵی هەقە، باوەڕیان بە هەر یەك ئەم هەقیقەتانە هەبێت و لە سەری بڕۆن. ناولێنانی کۆمەڵەکەش وەك لە پێشتردا باس کرا، هەر بۆ ئەم بنەمایە دەگەڕێتەوە کە لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمدا زۆرتر لە لایەنی ئایینیدا ڕەنگی دابوویەوە و لە سەردەمی مامەڕەزادا چووە ناو باری کۆمەڵایەتییەوە و بە ناوی "ڕەوشت"ـەوە سنووری بۆ دیاری کرا.

**٢- برایەتی (خوشك و برایەتی):**

مەبەست لە تەبایی و پێکەوەییە. هەموو ئەندامانی کۆمەڵی هەقە، خۆیان بە خوشك و برای یەکتری داناوە و پێیان وابووە ماف یەکسان لە نێوانیاندا هەیە. خۆشەویستییەکی خوشك و برایانە، هەموویانی بەیەکەوە بەستووەتەوە و وەك

پەیمانێکی گیانکرد، کۆمەڵی هەقەیان بە یەك خێزان داناوە. لە ئەم پەیمانەوە، ئەگەر هەر تێکەڵاوبوون و جۆرە ڕەوشتێکیان نواندبێت، ئەوا بۆیان بووەتە قسە و سەرزەنشت کراون و تانەیان لێدراوە.

**٣- هەوڵدان بۆ نەمانی جیاوازی چینایەتیی و ڕەگەزیی:**

لە نێوان شێخ و جووتیار، دەوڵەمەند و هەژاردا، جیاوازییەکی ئەوتۆ دیار نەبووە. ناکۆکی لە سەر ئاستی ئابووری، نەژادیی و ڕەگەزی لە کۆمەڵی هەقەدا، لە چاو کۆمەڵی کوردەواری ئەو سەردەمانەدا، زۆر باشتر بووە و زۆربەیان لە یەك ئاستدا بوون و چینی سەروتریان تێدا نەبووە. لە سەر ئەم بنەمایە، دەگێڕنەوە کە کاتی خۆی، چەند دەسەڵاتدارێك کە خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆربوون، یان چەند کەسێك بۆ هەر مەبەستێك بووبێت، کاتێك ویستویانە ببن بە هەقە، وازیان لە موڵکداریی و ئەو بەهایانە هێناوە کە لەگەڵ ڕێبازی هەقەدا نایەنەوە، لە ئێرەدا تەنها دوو نموونە بۆ سەلماندنی ئەم بنەمایە دەهێنینەوە:

نموونەی یەکەم: ((سێ ئاغا بوون بە هەقە، یەکێکیان "مەحموود ئاغای میراودەلی" بوو، کە یەکێك بوو لە دەوڵەمەند گەورەکانی ناوچەی پشدەر... ئەو دووانەکەی تریشیان "جەمیلی عەلۆی دزەیی و شێخ حەسەنی شێخ عومەری خانەقا" بوون، کە خاوەن موڵك و نیمچە دەرەبەگ بوون. ئەمانە لە ئەیلوولی ١٩٤١دا بوون بە هەقە و بۆیەش بوون بە هەقە؟ چونکە حەزیان لە دووکچی جوانی هەقە کردبوو، بەڵام کچەکان وتبوویان تانەبن بە هەقە شووتان پێ ناکەین.))[1]

نموونەی دووەم: (("کوێخا سمایلی مەلا سەق" کە یەکێك بووە لە پیاوە گەورەکانی تایەفەی کوێخا لە عەشیرەتی شیلانە لە بنگرد، کاتێك ڕێبازی هەقەی

١- ئاوردانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پاشبەندی یەکەم، ل١١٠ و ١١١.

وەرگرت، ئیتر گوێی نەداوەتە هەڕەشە و فشاری عەشیرەتەکەیی و گوندی بنگردی بەجێ هێشتووە و وازی لە دابونەریتی عەشیرەتەکەی هێناوە. لەبەر ئەوەی کە ڕووی لە گوندی مەلاسەفیی کرد– کە ئەم گوندە وەك مەڵبەندێکی ڕووتنەوەکە وەهابووە– ئیتر هەر بەناوی ئەم گوندەشەوە ناوبانگی دەرکرد.))[1]

## ٤- داینکردنی بیمەی کۆمەڵایەتی و پێدانی ئابوونە یان مانگانە:[2]

لە سنووری کۆمەڵی هەقەنشیندا، ئابوونەی مانگانە هەبووە کە لە ڕێگەی براسەیارەکان، یان موخلیسەکانەوە ئەم ئابوونەیە لە هەر خێزانێك کۆکراوەتەوە و کاروباری تەکیە، خاناقا و کۆمەڵی هەقەی پێ دابین کراوە. ئەوەی ڕاستیی بێت، یاسایەك بۆ کۆکردنەوەی ئەم ئابوونەیە نەبووە، واتە: هەر کەسێك بەپێی توانا و ویستی خۆی، پارە یان بەشێك لە بەرهەمەکەی پێشکەش کردووە. ئەگەر کەسێك کارەساتێکی بەسەرهاتایە، لە ئەم پارە و بەرهەمە مۆڵکراوە، بیمە کراوە و نەهێڵراوە کارەساتەکەی پێوە دیاری بدات. ئەم بیمەکردنە، تەنها بۆ هەقەکان نەبووە، بەڵکو بۆ هەر کەسێك بووە کە پەنای بۆ هەقەکان بردبێت. کاکە حەمەی شێخ بەکر دەڵێت ((هەر پیاوێك یان هەر ئافرەتێك لە هەر تایفە و عەشیرەتێك

---

١- نامەیەکی (ڕەشید محەممەد عەلی) بۆ لێکۆڵەر لە ٢٠٠٩/١١/٢٥دا.

٢- ئەم خاڵە لەلایەن مامۆستا جەعفەرەوە بە هەڵە لێکدراوەتەوە کاتێك دەنووسێت ((هەر هەموو ئەندامانی گوند، کاسەی هاوبەشیان Gemeinschaft Kasse هەبووە... دانیشتوانی دێیەکە هەر کەسە گیرفان و باخەڵی تایبەتی خۆی نەبووە، بەڵکو هەموو گوندەکە یەك "باخەڵ"ی هەبووە... هەرچی داهات هەیە لە ناو باخەڵدا کۆبووەتەوە و هەرچی مەسرەفیش هەیە هەر لەو باخەڵەدا دەرچووە، واتە: ئەو خەڵکە دەستیان لە مەسرەفی تایبەتی خۆیان هەڵگرتووە و هەموو دانیشتوانی گوند، پێداویستییەکانیان داپۆشراوە و لە سەر یەك سفرە خواردنی هاوبەشیان بۆ کراوە.)) بڕوانە (ئیدارەی کوردی ئاستەنگ و ئاسۆی گەشەکردن، سەرچاوەی پێشوو...، ل٧١.)

بوایە، ئەگەر بێکەس و دەستکورت بوایە، ئەوا دەچووە ماڵی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە و ئەوان لە ئەویٚ بەبیٚ منەت بەخێویان دەکرد.))[1] تەنانەت ئەم خۆشەویستیی و گیانی هاوکارییە، کە لە خانەقاوە دەردەچوو، پاڵی بە هەندێك کەسەوە نابوو تا وەسیەت بکەن لە دوای خۆیان بەشێك لە ماڵەکەیان بدرێتە خانەقا، بۆ نموونە (("مام عەبدوڵڵا" کە سۆفییەکی خەڵکی بنگرد بوو و یەکێك بووە لە دەوڵەمەندەکانی ناو بنگرد، وەسێتی کردبوو کە نیوەی سامان و مەڕ و ماڵاتەکەی لە دوای خۆی، بۆ خانەقا و ڕێبازی هەقە بێت، بەڵام خزم و کەسوکارەکەی بە ئەمە ڕازی نابن و ئەوەیان بۆ ڕوون کردووەتەوە کە ئەمانیش لەگەڵ ئەو سامانەدا ڕەنجیان کێشاوە و هەقیان تێیدا هەیە، ئەو کاتە بە ئەوە ڕازی بووە کە یەك لەسەر سێی بۆ خانەقا بێت و دوو لەسەر سێی بۆ منداڵەکانی بێت، تەنانەت سیٚ سەگی هەبووە و یەکیٚ لە سەگەکانی لەگەڵ مەڕەکاندا بۆ خانەقا ناردووە.))[2]

**٥- سەربەستی ئافرەت:**

جگە لە ئەو کرانەوە و جۆرە سەربەستییەی کە لە ئەم ڕێبازەوە چووبووە گیانی تاك بە تاکی کۆمەڵی هەقەکانەوە، ئافرەتیش ڕێزێکی تایبەتی بۆ دانراوە و لە کۆڕوکۆبوونەوەدا بەشداری کردووە. ئافرەتی هەقە بە ئەوپەڕی سەربەستییەوە هاوسەری خۆی هەڵبژاردووە و لە بەشوودانیاندا، شیربایی وەرنەگیراوە. لە چاو کۆمەڵگای کوردی ئەو سەردەمانەدا، زۆر کەمتر فرەژنییان کردووە. ئافرەتی هەقە، ڕەدوو نەکەوتووە و پیاوی هەقەش ئافرەتیان ڕەدووی خۆیان نەخستووە.

---

١- یاداشت نامەی ژیانم، سەرچاوەی پێشوو،...، ل١٧٩.

٢- نامەیەکی (ڕەشید محەممەد عەلی) بۆ لێکۆڵەر لە ٢٠٠٩/١١/٢٥دا.

باوەڕیان بە سەربەستی ئافرەت وای کردووە کە خانەقای شەدەڵە ببێتە لانەی پاراستن و بەرگریکردن لە چەند ئافرەتێك لە ئەم لایەنەوە باس لە ژن و پیاوێك دەکرێت کە هەر یەکەیان لە هاوسەری خۆیان جیابوونەتەوە و بڕیاریان داوە لە خانەقای شەدەڵەدا پێکەوە ژیانێکی نوێ درووست بکەن.

### ٦- کۆڕی پرس و ڕاوێژکردن:

لە کاتی پێویستدا خوشك و برای مەقە، هەموو بەیەکەوە و بەبێ جیاوازی، کۆبوونەتەوە و ڕاوێژ و ڕاپرسییان لە سەر بابەتێك کردووە، کە سەرەنجام هەمووان گەیشتوونەتە ئەنجامێك و کاریان پێی کردووە. هەموو ئەندامانی کۆمەڵی مەقە، کە تەمەنێکی پێگەیشتوویان هەبووبێت، لە ئەم پرس و ڕاپرسییەدا، مافی دەربڕینی بیروبۆچوونیان هەبووە[1].

### ٧- هزری ناتوندوتیژی:

ئەم بنەمایە، لە کۆمەڵی مەقەکاندا بووەتە کەلتوور. لە مێژووی ئەم کۆمەڵەدا، کوشتن و شەڕکردن زۆر کەم تۆمارکراوە. چەند حاڵەتێکی داکۆکیکردن لە مافی گشتیی و یارمەتیدانی شۆڕشی کوردی لێ دەربچێت، چەکیان هەڵنەگرتووە. تەنانەت لە هەڵوێست وەرگرتنەکەی ساڵی گوێنییەکەشدا (١٩٣٤ز) کە بە مەبەستی شوێنکەوتن و ڕزگارکردنی شێخ عەبدولکەریم بەڕێ کەوتن، کەسیان توندوتیژییەکیان نەنواندووە! بەڵام لە سەر ئاستی خودی شێخ و بۆ هەندێك بابەت کە لە لای شێخ هێڵی سوور بووە، شێخ پەرچەکردای توندی هەبووە، بۆ

---

١- ئەگەرچی لە ئێستاشدا بەشێوەیەك لەشێوەکان لە ئەم کۆبوونەوەیە لە کاتی جەژنە ئاینییەکاندا لە خانەقای کەلکەسماق دەکرێت، بەڵام لەڕووی جۆر و مەبەستی کۆبوونەوەکەوە، لەگەڵ کۆبوونەوەکانی سەردەمی شێخ عەبدولکەریمدا، جیاوازی زۆری هەیە.

نموونه کاتێك شێخ له کاری هەندێ سۆفیی و شێتەکان بێزار بووە، بە دەستی خۆی ((له سۆفییەکانی داوە و بەتوندی له گەڵیاندا جووڵاوەتەوە تا ئەو ڕێگایە نەگرن، بەجۆرێك بووە داوای مەخفەرێکی پۆلیسی لە ئەوێ کردووە.))[1]

## ٨- نهێنی ڕاگرتن:

کۆمەڵی هەقە، کۆمەڵێکی داخراوبووە و نەیانهێشتووە کەسانی تر زانیاری لە سەریان کۆبکەنەوە. لە باسەکانی دواتردا، زۆرتر لە سەر ئەم بنەمایە دەدوێین.

---

١- ڕۆژنامەی العراق، وتارێکی جەمال بابان، ژمارە ٢٢٣٤، ١٩٨٢/١٠/٥. بەڵام ئەم هەڵوێستە ئەوەندە گەورە و زۆر نەبووە کە لە کۆنترۆڵی شێخ دەربچێت و شێخ داوای هێزی پۆلیس بکات؟ تەنانەت بوونی پۆلیس لە ناوچەکەدا گرفتی بۆ کۆمەڵی هەقە ناوەتەوە، وەك چۆن (ڕەئوف محەممەد زوهدی) دەنووسێت ((دێی سەرگەڵو دێیەکی هێمن و لە سەرخۆبوو، هیچ ناکۆکییەکی وەهایان نەبوو کە پێویستیان بە پۆلیس و پۆلیسخانە بێت... لە ئەم لایەنەوە لەوێ پۆلیس هیچ دەورێکیان نەبوو کە لە خزمەتی ئەوان و لە خزمەتی گەلدا بن، بەڵام وادیاربوو کە دەورێکی تریان پێ سپێردرابێت! لەکاتی ورووژانەکەیاندا excitation هەندێکیان وەك ئەوان جلی گونییەیان لەبەردەکرد و دەچوونە ناویانەوە... خۆیان واپیشان دەدا کە گوایە "هیمەت و بەرەکەتی شێخ" ئەمانیشی ڕاکێشاوە و کەمەکێش یان کەمەندکێشی کردوون... ئینجا بۆ ئەوەی جێی باوەڕ و متمانەی ئەوان بن، لە ئەو بەزم و ڕەزمەدا سرەوتیان نەبوو، لە هەقەکان بەجۆشتربوون... بەزاراوەی سیاسی لە ئەوان چەپڕەوتر بوون... هەند هەندێکی تریان بەرگە ڕەسمییەکانیان دادەکەند و جلیان دەگۆڕی... سەریان و بنیانیان لە ئافرەت دەگرت، چاوبڕکێیان لەگەڵدا دەکردن... لەپەنای ئەم ئەرکەوە کە دیاربوو فەرمی بوو، چونکە دەبوایە سنوور و لێپرسینەوەیەکی هەبوایە... بەتایبەتی سەبارەت بە کابرایەکی فەرمانبەری میری کە نابێت کارێکی وابکات... خۆ ئەگەر ئەو ئافرەتە بەسەرزمانانەش لە ئەمان قۆزتر و لاوچاکتریان دەست نەکەوتبێت و تەنها بە تیری ئەشقی ئەمان گرفتار بوبن... دە ئەوەندەی تریان پێوەدەنا و بە ئاشکرا دەیانگێڕایەوە و باسیان دەکرد... لە سەرەتاوە بەمەبەستی ناوزڕاندنیان، لەدوایدا ئاراستەکردنیان بۆ سەر ئەو ڕێبازەی کە خۆیان مەبەستیانە.)) بڕوانە (بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٤- ٥٥)

## قۆناغی دووەم (١٩٤٢-١٩٨٦)

ئـەم قۆناغـە بـۆ دوو ڕێـچکە دابـەش دەکرێـت کـە ئـەوانیش ڕێـچکەکانی (مامەڕەزایی و ڕێچکەی حەمەسووریی)ن:

### بەرنامەی مامەڕەزا:

ئەگەرچی ((مامەڕەزاش هـەر لـە سـەر ڕێبازی شێخ عەبدولکـەریم ڕۆیشتووە، بەڵام لە ئەو زۆرتر ڕووی لە خزمەتی کۆمەڵایەتیی کردووە و کۆمەڵی هەقەی بەرەو بیروبـاوەڕی پێـشکەوتوخوازیی و نیـشتیمانپەروەریی بـردووە.))[١] وەنـەبێت ئـەم گۆڕانکـاریی و ڕێچکەیە لـە بـیری هەقـەدا، هـەروا لـە خـۆوە لـە بـیری مامـەڕەزادا سەرچاوەی گرتبێت، بەڵکو بەرئەنجامی چەند فاکتـەرێك بـووە کـە وەك پێویـستی هاتووەتە پێشەوە، بۆ نموونـە ((هۆیـەکی گـەورەی بیرکردنـەوەی مامـەڕەزا بـۆ ڕێکخستنەوەی بزووتنەوەی هەقە، ئەوە بووە کە بزووتنەوەکـە تـا ئـەو کاتـە وەك بزووتنەوەیەکی ئایینی و سۆفیانە ناوبانگی دەرکردبوو، بـەڵام لـە سنووری شـەرع دەرچـوونی زۆر لـە سـۆفیی و موریـدەکان، بەتایبـەتی لـە حـاڵی جەزبـەدا و ئـەو گفتوگۆ و دەمەتەقێ فەلسەفیانەی لە ناو ڕیزەکانیدا بووبوو بـە بـاو، مەسـەلەکەی خەست کردبووەوە و کار گەیشتبووە ڕادەیەك کە هەقـە وەك کۆمـەڵێکی لـە ئـایین دەرچوو ناوبانگ دەرکەن و لە ئەم بەینەدا شتە سەرەکییەکەی هەر بزووتنەوەیەك کە لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە پەیدا دەبێت با پێیشی نەزانرێ، کە ڕێکخستنەوەی ژیـانی کۆمەڵایەتییە؛ بەشێوەیەکی خراپتر لـە جـاران کـەوتبووە دواوە... بۆیـە پێویـست بوو کـە مامـەڕەزا بیرێکـی ورد لـە ڕێکخستنەوەی بزووتنەوەکـە بکاتـەوە و کارێـك بکـات کـە بنـەڕەتێکی ئایـدیایی و کۆمەڵایـەتیی و ڕەفتـاریی دابنـێ.))[٢] لـە ئـەم

---

١- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٥٥.

٢- هەمان سەرچاوە، ل٦١- ٦٢.

پێناوەشدا، جگە لە ئەوەی چەند بنەمایەکی نەنووسراوی بۆ کۆمەڵی هەقە دانا، ئەو دابونەریت و خاڵانەشی کە حەمەسووری کلاوقوت وەك یەکێك لە دامەرزێنەرانی بیرۆکەکەی بوو، وەك "ڕەوشت"[1] و "براسەیارەکان"[2] مامەڕەزا کردنییە کارنامەی ڕێچکەکەیی و هەوڵی دەدا کە ئەم لای خۆیەوە پیادەیان بکات.

بەشێوەکی گشتی، دەتوانین بەرنامەی مامەڕەزا بە هەموو ئەو خاڵانەی کە بۆ بەرنامەی شێخ عەبدولکەریم باسمان لێوەکردن[3]، لە ئەم چەند خاڵەدا چڕبکەینەوە:

---

١- شێخ حوسەینی خانەقا دەڵێت ((ڕەوشت: بریتیی بوو لە قاعیدە و نیزامێك بۆ بەربەستی خراپە و دەست درێژی. حەمەسوور لە ریزی پێشەوەی ئەوانە بوو کە بیریان لە ئەمە کردەوە. لەگەڵ یارمەتی دەرێکی کە ناوی "حەسەن جۆبلاخی" بوو، هاتنە لای من و سکالای ئەم مەسەلەیەی کرد و وتی: نیازی شتێکم هەیە و منیش بە باشم زانی و گفتی یارمەتیم پێدا. ئەمەبوو سەرچاوەی دانانی ڕەوشت و پاشان مامەڕەزا بە یارمەتی شێخ محەممەد ئەمینی مەڵحە، کە وەك دەستەڕاستی بوو، مەسەلەکەیان قۆستەوە و بڵاویان کردەوە و بە ناوی ئەوانەوە دەرچوو.)) بڕوانە (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پەراوێزی ژمارە ٢، ل٦٢.)

٢- مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا سەبارەت بە براسەیارەکان دەڵێت ((یەکەم جار حەمەسوور ئەم ڕێبازەی دانا بۆ هەندێ لەهەقەکان کە کار نەکەن تا بەدێهاتەکاندا بۆ ئامۆژگاریی و خەڵك ڕاکێشان و پروپاگەندەکردن بگەڕێن.)) بڕوانە (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، پەراوێزی ژمارە ١، ل٨٢.)

٣- مستەفا عەسکەری لە کتێبەکەیدا (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە) تەنها بەرنامەی مامەڕەزای نووسیوە و لەهەندێك خاڵدا لەگەڵ بەرنامەی شێخ عەبدولکەریمدا تێکەڵی کردوون، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە لە چەند خاڵێکدا، جیاوازی بابەتیی و کاتیی لە نێوانیاندا هەیە، بۆیە بەباشمان زانی بە ئەم شێوەیە جیایان بکەینەوە.

**١- ڕەوشت:**

چەند یاسایەکی هەمەلایەنەی کۆمەلایەتی، تەندروستیی و ئابووری نەنووسراو بووە، کە لە سەر هەموو ئەندامانی کۆمەڵی هەقە پێویست بووە بەبێ جیاوازی لێی لانەدەن و پێڕەوی لێ بکەن. خۆ ئەگەر هەقەیەك ((پێڕەوی لێ نەکردایە، یان بە پێچەوانەوە بجولایەتەوە، پێیان دەوت "بێڕەوشت" و بەگوێرەی جۆری بێڕەوشتییەکەی، دەبوو هەندێ پارەبدات، یان بۆ ماوەیەك "تەجمید" بکرێت، یان ئەرکێکی بەسەردا بدرێت.))[1]

ڕەوشت چەند لایەنێکی جیاوازی ژیانی گرتووەتەوە، وەك ((دەست و زمان پاکی، دوورکەوتنەوە لە درزیی و درۆزنیی و بوختان و دووزمانی. ڕاگرتنی پاکوخاوێنی، پاراستنی لەشساغی، پێڕەوی فەرمانی ناو کۆمەڵ کردن و دەرنەچوون لە ڕیزی برایەتی. دوورکەوتنەوە لە تەماعکاریی و چەوساندنەوەی خەلکی، دوورکەوتنەوە لە کەسانی گومانلێکراو، چ لە ڕووی ئایینییەوە و چ لە ڕووی دنیاییەوە. لە کاتی بینینی یەکتر و چاکوچۆنی لەگەڵ یەکتریدا، دەبێت دەست بخەنە ناودەستی یەکتر[2] و بڵێن "یاکەریم و یاڕەزا" کە مەبەستیان لە دوو ناوی خوا[3] بووە.))[4]

---

١- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٧٥.

٢- لە ئەم تەوقەکردنەدا دەستگوشین نەبووە، تەنها سەری پەنجەیان گەیشتووەتە یەك و لە ئەوە بەولاوە دەستیان نەدەچوونە ناو دەستی یەکەوە. (مستەفا عەسکەری)

٣- (محەممەد مەلا کەریم) دەنووسێت ((من وای بۆدەچم مەبەست لە (کەریم) و (ڕەزا) شێخ عەبدولکەریم و مامەڕەزا بووبێت، بەتایبەتی کەوا دیارە ئەم دروشمە لە سەردەمی مامەڕەزادا هاتووە نەك لەسەردەمی شێخ عەبدولکەریمدا کە هێشتا نەدەزانرا پاش ئەو کێ ئالای شێخییەتی هەڵدەگرێ. هەرچۆن بێت، ئەو کەسەی ئەم دروشمەی خستووەتە سەرزاری خەڵك، ئەوەندە زیرەك بووە بتوانێ بڵێت: مەبەستم لە (کەریم) ناوی خوا و لە (ڕەزا)یش ئیمام عەلی ڕەزای کوڕی ئیمام مووسای کازمە.)) بڕوانە (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٧٨.)

٤- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٧٦، ٧٧، ٧٨.

**٢- سەربەستی ئافرەت:**

ئافرەتی کۆمەڵی هەقە لە ئەم قۆناغەدا، سەربەستییەکی زۆرتریان هەبووە. ئەو کەلتوورەی کە لە ئەم بارەیەوە لە سەردەمی شێخدا سەبارەت بە ئافرەت و سەربەستی ئافرەت دروست بووبوو، لە سەردەمی مامەڕەزادا، زۆرتر گەشەی کردووە و پەرەی سەندووە.

**٣- هزری ناتوندوتیژی:**

مامەڕەزا لە ژیانی تایبەتی خۆیدا، جگە لە ئەوەی بە کەسێکی هێمن و لە سەرخۆ بەناوبانگ بووە و توندوتیژی بەرامبەر بە کەس نەکردووە، ((ڕێگری لە ئەوەش کردووە کە هیچ کەسێك لە هاوباوەڕ و موخلیسەکانی بەکاری بهێنن، هەر ئەم بیروباوەڕەشی بوو کە پاڵی پێوەنا ببێتە ئەندامی ئەنجوومەنی ئاشتیخوازانی ئێراق، چونکە ئەم سیفەتەی لە شێخی گەورەوە بۆ مابووەوە.))[١] لەگەڵ ئەوەشدا کە مامەڕەزا دەسەڵاتێکی زۆری هەبووە، هیچ کاتێك ئەم دەسەڵاتەی بۆ زۆرداریی و توندوتیژی بەکار نەهێناوە و هەمیشە پشتگیری لە بیری ئاشتیخوازانە کردووە لە هەر شوێنێکدا بێت، بۆ ئەم مەبەستەش پشتگیری لە بیری ئاشیخوازانی جیهان کردووە و ((بووەتە ئەندامی ئەنجوومەنی ئاشتیخوازانی ئێراق.))[٢] کە لە ئەو کاتانەدا بۆ بەرەنگاربوونەوەی هزری توندوتیژی دامەزرابوو. ئەم بیروباوەڕەی مامەڕەزا، بووبووە بیروباوەڕی هەموو ئەندامانی ڕێچکەکەی و ((دەیانەویست بیروڕاکانیان لە ڕێگەی دیالۆگی ئاشتییانەوە، لە دژی توندوتیژی بڵاوبێتەوە.))[٣]

---

١- نامەیەکی (ڕەشید محەممەد عەلی) بۆ لێکۆڵەر لە ٢٠٠٩/١١/٢٥دا.

٢- ڕێڕەوی تێکۆشان، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢١١ و ٢١٢.

٣- هەمان سەرچاوە، ل٢١١.

سەبارەت بە ئاشتی دۆستیی و ئارامی ژینگەی کۆمەڵایەتی ئەو ناوچانە، (جەمال بابان) دەنووسێت ((ئەو ماوەیەی کە من لە ناو هەقەنشینەکاندا بووم[1] رۆژێك تاوانێك رووی نەدا نەهاتنە پۆلیسخانە شکاتێك بکەن، یان یەکێك شکاتیان لێ بکات. دەست درێژییان نەدەکردە سەر موڵك و ماڵی کەس و کۆمەڵێکی بەرێز و سەلار و خاوەنی کردەوەی جوان بوون.))[2] هەروەها (شاکیر فەتاح) دەنووسێت (("شێخ رەزا" لە ترسی خوێن رشتن، هەڵگرتنی چەکی لێ قەدەغە کردبوون. نزیکی دوو ساڵ لە رانیە بووم، ئەم بیست جارێك شەڕ و شۆڕێك، کوشتن و برینێك، دزییەك، ژن هەڵگرتنێك لە ناو هەقەکاندا روویدات!))[3]

## ٤- نهێنی راگرتن:

کۆمەڵی هەقە، هەر لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمەوە، وەك کۆمەڵێکی داخراو مامەڵەیان لەگەڵ چواردەوریاندا کردووە و زۆر بە کەمی تێکەڵاویان لەگەڵ کەسانی دەرەوەی خۆیاندا کردووە. هەر کەسێك چووبێتە ناویانەوە، رێزی زۆریان لێ ناوە، بەڵام نەیانهێشتووە بەشداری کۆبوونەوەکانیان بکەن و رێگەیان نەداوە کەس ئەو سنوورە ببەزێنێت کە ئەمان دەیانەوێت. لە سەردەمی مامەرەزاشدا بەهەمان شێوە نهێنی راگرتن و خۆگرتنەوە لە هەندێ باس، نەك هەر بەردەوام بووە، بەڵکو وەك "رەوشت" مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، کە رەنگە هۆیەکی ئەمە ئەوەبێت کە لە سەردەمی مامەرەزادا، پێگەی کۆمەڵایەتیی و ئابووری کۆمەڵی هەقە، بەرەوپێشەوە رۆیشتووە و لە ترسی تێکچوونی ئەو بەرەوپێشەوەچوونە، گومانیان لە کەسانی دەرەوەی خۆیان کردبێت، کە ئەم ژیان و رێکخستنەیان

---

١- مەبەستی لە ١٢/٣/ ١٩٥٥ – ١٩٥٦/٦/٢١ یە.

٢- یاداشت نامەی ژیانم، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٧٨.

٣- ئارێنەی ژینم، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٨٧.

بشێوێنن و لێیان تێك بدەن. لە ئەم بارەیەوە (شاكیر فەتاح) دەنووسێت ((سێ جار چوومە ناو هەقەكان، تێكەڵاویان بووم، لەگەڵ شێخەكانیشیاندا گفتوگۆم كرد، بۆم دەركەوت كە: شێخەكان بێجگە لە هەقەكان، ناهێڵن كەسی تر بچنە ناو كۆبوونەوەكانیانەوە، هەروەها ئەو شتانەیش كە بە هەقەكانی دەڵێن، بۆ كەسی بێگانەی ناگێڕنەوە، با ئەو كەسە كورد و موسوڵمانیش بێ.))[1] هەروەها (جەمال بابان)یش كاتێك دەیەوێت ڕازی بەرنامە و زانیاری لە سەر هەقەكان دەست بكەوێت، هەمان ڕاستی بۆ دەردەكەوێت و دەنووسێت ((ئەو ماوەیەی كە لە میرزا ڕۆستەم بووم، زۆر هەوڵم دا لەگەڵ هەقەكاندا كە شتێكیان لێ تێبگەم و لای خۆم بینووسم، هەرچەندم كرد هیچیان لێ تێنەگەیشتم، لام وایە ئەوانیش نەیان دەزانی یان نەیان دەتوانی ئەوەی لایانە ڕوونی بكەنەوە؟ چونكە خوێندەوارییەكی وایان نەبوو... هەروەها ئەگەرچی زۆریش لە پیاوێكی زیرەك و بەتوانای وەك "شێخ حسێنی سەید ئەحمەدی خانەقا"وە نزیك بووم، كە ماوەیەك تێكەڵیان بوویوو و شتی دەزانی، نەمتوانی لە ئەم ڕووەوە كەڵكی لێوەرگرم.))[2] تەنانەت لە ساڵی ۱۹٥۷دا كاتێك (هێنی هارۆڵد هانسن) سەردانی سەرگەڵو دەكات دەڵێت ((بەگوێمیان چپاند كە سەرگەڵو لە دەمی خۆی ناوچەی هەقەكان بووە... خەڵكەكە بە ترس و ڕێزەوە باسیان دەكرد.))[3] كە لێرەدا ئەوە دەردەكەوێت تا چەند خەڵكی بە پێویستیان زانیوە ئەم بابەتە بەنهێنی ڕابگیرێت و نەدركێنرێت، تەنانەت وەك ناوچەیەكی هەقەنشینیش بە چپە بەگوێدا دراوە!

---

١– هەمان سەرچاوە، ل١٨٨.

٢– یاداشت نامەی ژیانم، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٧٧.

٣ – كچانی كورد، هێنی هەرۆڵد هەنسن، وەرگێڕانی: ناجی عەبباس ئەحمەد، چاپخانەی كۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٠، ل١٢٥.

### ٥- کۆڕی پرس و ڕاوێژکردن:

بەهەمان شێوەی سەردەمی شێخ عەبدولکەریم، ئەندامانی مامەڕەزایی کۆبوونەتەوە و پرس و ، اوێژیان سەبارەت بە باسی ڕۆژگاری خۆیان کردووە. ئەوەی ڕاستی بێت، زۆرم هەوڵ دا تا لە بارەی ناوەڕۆکی ئەو قسەوباس و گفتوگۆیانەوە شتێکم دەست کەوێت سەبارەت بە ئەوەی کە لە ئەو کۆبوونەوانەدا کراون و وتراون، بەڵام لە ئەوەندە زیاتریان نەدەوت کە وەك چۆن ئەمڕۆ لە نوێژی هەینیدا وتار پێشکەش دەکرێت، بەهەمان شێوە لە بارەی خوا و پێغەمبەرەوە، قسەوباسیان کردووە. بەڵام نابێت ئەم کۆبوونەوانە، بەهەمان شێوەی کۆبوونەوەی ئاسایی شەوانەی ناو چەند خێزانێك دابنێین کە مەبەست تێیاندا هەر بۆ خۆشیی و کات بەسەربردن بووە؟ چونکە ئەو کۆبوونەوانە شێوەیەکی فەرمی هەبووە و ڕەوشی بەشداریی و چۆنێتی ئامادەبوون لە ئەم کۆبوونەوانەدا، بەجۆرێك بووە کە ((ژن و پیاو، پێکەوە دادەنیشن و بۆ گوێگرتن لە پەند و ئامۆژگاریی شێخەکەیان کۆدەبنەوە، هەروەها ئەوەش ڕاستە کە لە ئەو کۆبوونەوانەدا، ژن و پیاو خۆیان بە جلوبەرگی جوان دەڕازێننەوە.))[1]

### ٦- دەستگیرۆیی و داڵدەدان:

چ مامەڕەزا و چ مامەڕەزاییەکان، بەدەستگیرۆیی هەژاران و لێقەوماوان ناسراون. لە ئەم بارەیەوە دەگێڕنەوە کە ((کاکە حەمەی شێخ بەکر کە لە سلێمانی دادەنیشت و یەکێك بوو سەر بە هەقە، وەختی خۆی لە چاوپێکەوتنێکدا لە ئەم بارەوە وتویەتی: ساڵێکیان لەگەڵ کاکە حەمەی خانەقا، شێخ حوسەینی برای، کاکە ڕەزای سەرگەڵو و مامە قالە، چووینە دێی کەلکەسماق لە ئەوێ لە

---

١- ئاوێنەی ژینم، سەرچاوەی پێشوو،... ل١٨٨.

ماڵی کاکە ڕەزا "٢٢" ئاگری جیاجیام دی کرابونەوە و هەر یەکە لە ئەو ئاگرانە، ئاگری ماڵە هەژارێك بوو کە لە ئەو حەوشەدەیەدا بوون و بەخێو دەکران.))[1] وەنەبێت ئەم هەڵوێستە هەر سەبارەت بە کەسانی هەژار و دەست کورت بووبێت، بەڵکو بۆ پشتیوانی گەل و حزبیش بەهەمان شێوە بووە. بۆ نموونە بەشداری و دەستگیرۆیی مامەڕەزاییەکان لە کۆماری کوردستاندا هەروەك لە پێشتردا باسمان کرد، هەروەها دالدەدانی ئەندامانی حزبی شیوعی[2] و ئەو ژمارە زۆرەی شیوعییەکان کە ماوەیەك لە کەلکەسماق بوون و پەیوەندییەکی پتەویان لەگەڵ مامەڕەزاییەکاندا دروست کرد، هەروەك (جەلال دەباغ) دەنووسێت ((لە دوای شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ەوە، ڕۆڵی برایانی مامەڕەزایی گەورەتربوو،

---

١- یاداشت نامەی ژیانم، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٧٩.

٢- مامۆستا هەمزەعەبدوڵلا، لە دەستنووسێکیدا کە بیرەوەری ئەو ڕۆژانەیە و ڕۆشنایی دەخاتە سەر بوونی پەیوەندییەکی لە ئەو شێوەیە دەنووسێت ((لە ساڵی ١٩٢٨دا لەگەڵ یوسف مەتی و زەکی خەیریدا گیرام، دوو تۆمەتم بەسەردا سەپا، یەکەم: بلاوکردنەوەی نامیلکەی "الاكراد و العرب"ی مامۆستا "ئیبراهیم ئەحمەد" و بلاوکردنەوەی شیعرێکی کوردی کە دانەری خودی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بوو... چونکە لە ماڵی یوسف مەتی گیرابووم، بە کۆمۆنیست لە قەڵەم درابووم. پاش شەش مانگ لە تەوقیف و مەحاکەمەکردن، لە مەحکەمەی جەزای بەغداد و موسڵ ئازاد کرام، بەڵام "یوسف مەتی و زەکی خەیری" دوو ساڵ لە بەندیخانە و دوو ساڵ لە موراقەبە لە "عانە"... لە ئازاری ١٩٣٨ شێخ عەبدوڵلای خانەقا، برازای سەید ئەحمەدی خانەقا، فێراری پێکردم، لە بەغداوە بۆ دێیەکەی "البوصباح" و لە ئەوێوە بۆ دێیەکەی خۆی "کەوەلە" کە نزیك کەرکوکە. پاش شەش مانگ، گوێزرامەوە بۆ خانەقای سەید ئەحمەد، بە ناوی مەلا براهیم لە ژێر ریعایەتی ئەو زاتە، تا ساڵی ١٩٤٢ کە ساڵێك لە "گۆیتەپە" لە ژێر چاودێری شێخ عەبدوڵلای عەسکەریی باوکی عەلی عەسکەریدا ڕام بوارد. لە ئەو چوار ساڵەدا، پەیوەندیم لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی ئێراقدا نەما، هەرچەندە پرۆگرامی ئەو پارتە لە لام پەسەند بوو.)) (ئەم دەستنووسە لە لایەن مامۆستا مومتاز حەیدەرییەوە لە "کەسایەتی مەلا مستەفا، هەمزەعەبدوڵلا، گۆڤاری k21، ژمارە ٢- ٣، ساڵی ٢٠٠٨، ل١٩- ٢١" دا بلاوکراوەتەوە، کە مێژووی نووسینەکەی بۆ ساڵی ١٩٩٧ دەگەڕێتەوە.)

پشتگیریی شۆڕش و ئامانجەکانیان دەکرد. لە ناو ڕێکخراوەکانی حزبی شیوعیدا، چەند شیوعییەکی دڵسۆزی حزب و مامەڕەزایی هەبوو، لەوانە: "مەلا سابیری سۆفی محەممەد" کە لە گەڕەکی کانێسکان دادەنیشت. لە ساڵی ١٩٦١ەوە کاتێ ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم لە ڕێبازی دیموکراسی دوورکەوتبووەوە، من وەك ئەندامێکی کۆمیتەی پارێزگای سلێمانی حزبی شیوعی ئێراق، ئەرکی بەرپرسی کۆمیتەی قەزای ناوەندی سلێمانییم پێ سپێردرابوو کە لە ئەو کاتانەدا، ناوچەی دوکانیش سەر بە ئەم قەزایە بوو، کاکە حەمیدی کوڕی مامەڕەزا، ئەندامی کۆمیتەکەمان بوو هەر خۆیشی بەرپرسی ناوچەی دوکان بوو، هاوڕێ حەمید کە دەهاتە سلێمانی، لە ماڵی هاوڕێ مەلاسابیر میوان دەبوو. هەر لە ئەم ساڵانەدا، شیوعییەکی تری مامەڕەزایی و کەسایەتییەکی تری ناسراوی کۆمەڵایەتی، بووە ئەندامی کۆمیتەکەمان کە ئەویش "حاجی شێخ محەممەدی شەدەڵە "بوو. چەند ئەندامێکی تری حزب لە ئەم بنەماڵەیەدا هەبوون وەك: مام تەهای مامەڕەزا و ساڵح عەسکەریی و... هتد.

دوای کودەتا شوومەکەی بەعسییەکان لە ساڵی ١٩٦٣دا، ئەو کاتانەی کە شیوعییەکان کەوتنە بەر شاڵاوی داپڵۆسین و بە هەموو لایەکدا پەرتەوازە بوون، مامەڕەزاییەکان سەلماندیان کە کەسانی بە وەفا و هەقخوازی ڕاستەقینەن، بە دەستپێشخەری کاکە حەمەی کوڕی مامەڕەزا و براکانی، دەرگای دێهاتەکانیان بۆ خستنە سەرپشت و داڵدەی هاوڕێ و دۆستەکانمانیان دا، بە تایبەتی لە گوندی کەلکەسماق کە بووبووە بارەگایەکی ڕاستەقینە و زۆرتر لە ٦٠٠ شیوعی لە ئەوێ کۆبووبوونەوە.))[1]

---

١- نامەیەکی (جەلال دەباغ) بۆ لێکۆڵەر لە ٢٠٠٩/٧/١٧دا.



**حەمیدی مامەڕەزا و تەهای مامەڕەزا***

هەر لەبارەی پەیوەندی مامەڕەزاییەکان بە حزبی شیوعییەوە، لە چوارچێوەی باسی کودەتای ڕەشی شوبباتی ١٩٦٣دا، (کەریم ئەحمەد) بیرەوەرییەکانی خۆی بە ئەم شێوەیە لەگەڵ مامەڕەزادا دەگێڕێتەوە ((پاش ئەوەی مامەڕەزا لە ڕێگەی گەورە شاعیری کورد "عەبدوللا گۆران"ەوە[1] حزبی شیوعی ناسی، بە

---

*- ئەم وێنەیە لە ئەرشیفی (جەلال دەباغ)ەوە پێشکەش بە لێکۆڵەر کراوە.

١- لە سەر پەیوەندی گۆران بە مامەڕەزاوە، (عومەر ئاشتی) دەنووسێت ((کاتێک وەک ئاشتیخوازاران هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت کە مامەڕەزا لە ئەخۆشخانەی سەلام لە شاری بەغداد کەوتووە، لەگەڵ گۆرانی شاعیر و دوو ئاشتیخوازی تردا لە سلێمانییەوە بەرەو بەغداد بەڕێ کەوتین. ئەو کاتانەشی کە ئێمە لە ئەخۆشخانە لەگەڵی بووین، بەبیرمە "فواد عارف"ی وەزیریش سەردانی کرد. پاش ماوەیەکیش کە هەواڵی ئەوەمان بیست مامەڕەزا کۆچی دوایی کردووە، بۆ پرسەکەی دیسانەوە لەگەڵ مامۆستا گۆراندا چووینە کەلکەسماق و شەوێکیش لە ئەوێ ماینەوە.)) (نامەیەکی "عومەر عەلی سەعید موتابچی" بۆ لێکۆڵەر لە ١/١٢/٢٠٠٩دا)

لایەنگرەکانی وت: ئێستا وا حزبی هەقمان دیتەوە، هەمووان دەبێت پشتگیری لە ئەم حزبە بکەین.))[1]

## بەرنامەی حەمەسوور:

حەمەسووری کلاوقوت جگە لە ئەوەی لە هەقیقەتنامەیەکدا[2] بەرنامەکەی خۆی دەخاتە ڕوو، دەتوانین لە ئێرەشدا پوختەی بەرنامەکەی لە ئەم چەند خاڵەدا چڕبکەینەوە:

### ١- ئابووریی هاوبەش و دابەشکردنی کار:

هەر لە سەرەتاوە و کاتێ ڕوویان لە ناوچەی شوان و گوندی کلاوقوت کرد، بەشێکی زۆری حەمەسوورییەکان دەستیان دایە بەهێزکردنی ژیانی ئابوورییان و سندوقێکی هاوبەشیان دانا، گرنگیی زۆریان بە کەرتی کشتوکاڵی دا و لە کاری دەستیشدا بە تەزبیح هۆنینەوە ناوبانگیان دەرکرد.

حەمەسوورییەکان هەموو شەوێك بەرنامەی کاریان دابەش کردووە و هەر یەکەیان بە کارێکەوە تایبەت کراون کە (سەید عومەر) لێپرسراوی دابەشکردنی ئەو کارانە بووە. (تەلحە سەید حەمیدی دەلۆیی) وەك یەکێك لە حەمەسوورییەکان ئەوە دەگێڕێتەوە کە ((دەبوو هەر کەسەو ئیشوکاری خۆی بزانیایە، بۆ نموونە من ئەگەرچی سەرەتا هیچ کاریان پێنەدەکردم، بەڵام لە دوایدا کاری نانکردنیان دامێ. هەر کەسەی کارێکی هەبوو، من نانکەر و یەکێکی تر

---

١- ڕێڕەوی تێکۆشان، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢١١ و٢١٢.

٢- ئەم هەقیقەتنامەیە لە شێوەی هۆنراوەدایە و لەدانانی خۆیەتی، لە کاسێتەکەی لای کاك عەباسدا، حەمەسوور بەدەنگی خۆی ئەم هۆنراوەیە دەخوێنێتەوە. (بڕوانە بەڵگەنامەی پێنجەم لە کۆتایی ئەم پەرتووکەدا.)

حاجەت شۆر، یەکێکی تر شتن و سڕینی حەوشە و... پارەی فرۆشتنی بەرهەمی ئاژەڵداریی و کشتوکاڵ و تەزبیح و هەرشتێکیش لای من دادەنرا و کاک "حەسەن زێنەب"یش شتی لێدەکڕیی و خەرجی دەکرد.))[1]

خاڵی جیاکەرەوەی سەرەکی نێوان مامەڕەزا و حەمەسووری کلاوقوت، بۆ ئەو گرنگی دانە زۆرەی حەمەسوور دەگەڕێتەوە کە بە ژیانی ئابووریی و پێکەوە کارکردن دابووی. لە سەرێکەوە ((حەمەسوور جۆرێك لە هاوسانیی بۆ جووتیار دروست کردبوو، بەڵام مامەڕەزا زۆرتر وەك سەرکردەیەکی ئاینیی یان تەریقەت بووە.))[2] لە سەرێکی تریشەوە لە سەردەمی مامەڕەزادا، کۆمەڵی مەقە ((بەرەبەرە وازیان لە چاندن و بەرهەم هێنانی زەوییوزار دەهێنا و کز دەبوون، هەژار دەبوون و شێخەکانیان هیچ ڕێگایەکیان بۆ نەدەدۆزینەوە کە تا دەرامەت و گوزەرانی پێوە بکەن!))[3]

## ٢-یاخی بوون لە شەریعەت:

حەمەسووری کلاوقوت هەر لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەوە، وەك سۆفیی و شێتێك بەهەمان شێوەی بیرکردنەوەی هەندێك لە سۆفییەکانی سەردەمی کۆنەوە، بیری کردووەتەوە و پێی وابووە ئەگەر کەسێك لە خوای باڵادەست نزیك بوویەوە، ئەوا تەکلیفی لە سەر نامێنێت، هەروەك چۆن لە کۆندا ((تایەفە و کۆمەڵێك لە سۆفی، بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە لە ناو دۆستانی خوادا، کەسانێك هەن کە لە سەرجەم پێغەمبەران و نێردراوان باشترن و پێیان

---

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (تەلحە سەید حەمیدی دەلۆیی) ڕۆژی ٢٠٠٩/٩/٢، کەرکووك.

٢- دەستنووسێکی (د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) ١٩٩٥ کە پێشکەش بە لێکۆڵەری کردووە.

٣- ئاوێنەی ژینم، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٨٧.

وایە: ئەو کەسەی بگاتە ئەوپەڕی ئاست و پلەی ویلایەت و دۆستایەتی، ئەوا سەرجەمی شەریعەتەکانی وەك: نوێژ، ڕۆژوو، زەکات و... لە سەر لادەچێت. تەنانەت ژنانی خەڵکی تر بۆ خۆیان بە ڕەوا و حەڵاڵ زانیوە.))[1] حەمەسوور بەشێوەیەك لە شێوەکان لە ئەم گۆشەنیگایەوە سەیری خواناسیی و ژیانی کردووە. ئەگەر سەرنج لە ئەو گفتوگۆ و باسانە بدەین کە حەمەسوور کردوونی، زۆر بە ئاشکرا ئەم بیروبۆچوونەی تێدا دەبینرێتەوە، بەڵام نابێت ئەمەش بە بیروباوەڕی هەموو حەمەسوورییەکان بزانین، چونکە ئەم بۆچوونە، تەنها بۆچوونی حەمەسوور بووە و هیچ کەسێکی تر قسەی لە ئەم جۆرەی نەکردووە، تەنانەت حەمەسوور خۆیشی، ئەم قسانەی نەخستووتە بواری جێبەجێکردنەوە و تەنها بەسەر زاریەوە بووە.

**٣- هزری ناتوندوتیژی:**

ئەو کەلتوورەی کە شێخ عەبدولکەریم دایمەزراندبوو، لە لای حەمەسوور و حەمەسوورییەکانیش بەشێوەیەك لە شێوەکان پیادەکراوە. هەمیشە لە بارگرژییەکاندا خۆی ڕێگەی ناوبژیوان و چارەسەری هەڵبژاردووە، هەر کاتێکیش کار گەیشتبێتە ئەوەی کە چارەسەر لە دەست دەرچووبێت، ڕێگەی یاسای بە باشترین ڕێگەی چارەسەر زانیوە. هیچ کاتێك خۆی یان شوێنکەوتەیەکی چەکی هەڵنەگرتووە و چەکی بەکاری نەهێناوە. مامۆستا (ڕەشید محەممەد) دەنووسێت ((لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا، ڕۆژێکیان لە کاکە حەمەم پرسی: لە ئەمڕۆدا هەموو کەس چەکی هەیە، ئەگەر بۆ پارێزگاری خۆشی بێت، بەڵام ئەوەندەی من

---

١- الصوفیە، أ. د. عبدالقهار داود العاني، سەرچاوەی پێشوو...، ص٦١- ٦٢. کە ئەمیش لە کتێبی (الملل و النحل، ج٣، طبعة ١، ص٢٢٦)ی وەرگرتووە.

لە تۆ و کۆمەڵەکەت تێبینی دەکەم، نەك هەر چەکتان نییە، بەڵکو باسیشی ناکەن!؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: مەلا ڕەشید، هەندێك چەل[1] دەڵێم: باقلێکمان[2] هەبێت، لە دوایدا دەڵێم: ئەوەشمان ناوێت، چونکە چەك نیشانەی توندوتیژیی و شەڕ و ئاژاوەیە، ئێمەش ئەو شتانەمان پێ خۆش نییە.))[3]

**٤- گرنگیدان بە فیکر و ئەقڵ. (بڕوانە هەقیقەتنامە)**

**٥- جگەرەنەکێشان و چا نەخواردنەوە. (لە پێشتردا ڕوون کراونەتەوە)**

**٦- منداڵ نەخستنەوە. (لە پێشتردا ڕوون کراوەتەوە)**

---

1- چل: جار.

2- قل: دانە.

3- نامەیەکی (ڕەشید محەممەد عەلی) بۆ لێکۆڵەر لە ٢٠٠٩/١١/٢٥دا.

## باسی دووەم:

### پەیوەندی هەقە و ئەهلی هەق

ئەهلی هەق، لە زۆر نووسین و دەربڕیندا لەگەڵ زاراوەکانی وەك (کاکەیی، عەلی ئیلاهی و عەلەوی)دا بە هاوواتا بەکارهێنراوە، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت، لە زۆر ڕووەوە خاڵی جیاوازیی و هاوبەش لە نێوان ئەم ناوانەدا لە لایەك و ئەهلی هەق لە لایەکی ترەوە هەیە، کە لە ئەم لێکۆڵینەوەیەدا تەنها لە ڕووی هاوبەشی نێوانیانەوە، بە هاوواتای یەکتری ناویان دەبەین.[1]

((وشەی کاکەیی لە کوردستانی ئێراقدا، بەگرووپێکی ئایینی دەوترێت کە لە خۆرئاوای ئێران "عەلیوللاهی"[2]،"عەلی ئەللایی" یان "عەلی ئەلایی"یان پێ دەڵێن. زانایانی ئەم ئایینە، خۆیان زۆرتر بە ئەهلی هەق و هەقیقەت واتە: پیاوی "خوا" و خواناس دەناسن... شێخ و ڕێبەری ئەم "ئایینە دەروونییە"

---

١– مینۆرسکی پێی وایە کە جیاوازی لە نێوان عەلی ئللاهیی و ئەهلی هەقدا هەیە و دەنووسێت ((عەلی کەسایەتی سەرەکی نییە لە ئایینی ئەهلی هەق، بێجگە لە ئەوەش تێرمی عەلی ئیلاهییش دەرهەق بە تایفەیەك بەکارهاتووە کە تا ئێستەکە نزیکایەتییان لەگەڵ ئەهلی هەق نەسەلمێنراوە. هەروەها دەنووسێت: شێخ مەحموودی حوکمداری کوردستان وتوویەتی: لە دوازدەهەمین وەچەی برای سوڵتان سوهاك کەوتووەتەوە. لە کەرکووك دەستنووسێك هەیە کە بنەچەناسی دوور و درێژی ئەم بنەماڵەیەی تێدایە.)) بڕوانە (بنچینەکانی کورد و چەند وتارێکی کوردناسی، ڤلادمێر مینۆرسکی، وەرگێڕانی: د. نەجاتی عەبدوڵلا، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٤٩– ١٥٠، ١٦٢.) خاتوو (هێنی هارۆلد هانسن)یش دەنووسێت ((هەرچۆنێك بێت دەتوانین بڵێین: ئەم مەسەلەیە، مەسەلەی پێڕەوکەرانی ئەهلی هەق نییە کە خواپەرستی ڕاستن و لە خۆرئاوای ئێران پێیان دەوترێت عەلی ئیلاهی و لە کوردستانی ئێراق پێیان دەوترێت کاکەیی و بەتایبەتی لە ناوچەی کەرکووك هەن.)) بڕوانە (ژیانی ئافرەتی کورد، سەرچاوەی پێشوو... ل٣٤٦.))

٢– ئەوەی ڕاستی بێت کاکەییەکانی ئێران بە خۆیان نالێن (عەلیوللاهی، عەلی ئەللایی، عەلی ئەلایی) بەڵکو ئەوان تەنها (ئەهلی هەق، یان یارسان) بەکاردەهێنن.

# سەید ئیسحاق کوڕە چکۆلەکەی شێخ عیسای[1-2] بەرزنجەیی

---

١- کاکەییەکان هەمیشە بە ناوەکانی موسا و عیسا دەڵێن: موسە و عیسە (ئیدمۆنز)، بەڵام ئەوەی ڕاستیی بێت، کاکەییەکان "عیسیٰ و موسیٰ" یان "عیسا و موسا"ش بەکاردەهێنن و هەمیشە ناوی عیسا پێش ناوی موسا دەخەن.

٢- سەبارەت بە بنچەی شێخ عیسیٰ و شێخ موسیٰ (محەممەد ئەمین زەکی بەگ) پێی وایە کە شێخ بابا عەلی برای فەیلەسوفی کورد بابا تاهیری هەمەدانی ناسراو بە (عوریان)ە، بڕوانە (تاریخ السلیمانیە و انحائها، محمد امین زکی، ترجمە: محمد جمیل رۆژ بیانی، طبع شرکە النشر و الطباعة العراقیە المحدودە، بغداد، ١٩٥١، ٢١٩) بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت، بیروڕای لە ئەمەش جیاوازتر هەیە. بڕوانە (الشیخ معروف النودهي البرزنجي، محمد الخال، دار مطبعة التمدن، بغداد، ١٩٦١، ص٦٩- ٧١.) هەرچی شێخ بابا عەلیشە، ((سێ کوڕی دەبێت بە ناوەکانی "شێخ محەممەدی نوربەخشی، شێخ موسیٰ، شێخ عیسیٰ"، شێخ محەممەدی نوربەخشی دەچێتە ئەفغانستان و لەوێ نیشتەجێ دەبێت. هەرچی شێخ موسیٰ و شێخ عیسێش هەیە، لەساڵی ١٣٥٩ز دێنە بەرزنجە و هەر لەوێ شێخ موسیٰ ژن دێنێ و پاش ماوەیەك بۆ ئیرشادکردن ڕوو لە ئاغجەلەر دەکات. لە ئەم بارەیەوە بۆچوونێکی تری هەیە و پێی وایە کە شێخ موسیٰ بۆ دروستکردنی تەکیە ڕوو لە "شەدەڵە" ی نزیك بە بەرزنجە دەکات و لەوێ "فاتمە" ناوێك دەکاتە هاوسەری خۆیی و لە ڕووداوێکدا لەلایەن کۆمەڵێکی لادەر لە ئیسلام، دەکوژرێت و دوای ماوەیەك شێخ عیسێی برای، فاتمە دێنێتەوە و سێ کوڕی بە ناوەکانی "شێخ عەبدولستار، سەید عەبدولکەریم، سەید عەبدولقادر"ی لێ دەبێت.)) بڕوانە (علماءنا في خدمة العلم والدین، عبدالکریم محمد المدرس، دار الحریة للطباعة، بغداد، الطبعة الأولى، ١٩٨٣، ص٤٢١.) دیارە لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا جیاوازی دەبینرێت لە ڕووی: ١- شوێنی ڕۆیشتنی شێخ موسیٰ بۆ ئیرشادکردن. ٢- دروستکردنی تەکیە. ٣- ئەو ژنەی کە سوڵتان ئیسحاقی لێ بووە. ٤- ساڵی لەدایك بوونەکەی. چونکە بەپێی سەرچاوەی (تاریخ السلیمانیة و انحائها، سەرچاوەی پێشوو... ص٢١٩.) ساڵی هاتنی هەردوو برا بۆ بەرزنجە (١٣٥٩ز)یە و لە نێوان ئەم ساڵە و ڕۆیشتنی شێخ موسیٰ بۆ شەدەڵە یان ئاغجەلەر و ژن هێنانی کە نەگەیشتووەتە ئەوەی منداڵی هەبێت بمرێت و هێنانەوەی ژنی براکەی لە لایەن شێخ موسێوە و لەدایك بوونی سوڵتان ئیسحاق، وەك یەکێك لەو دوازدە کوڕەی کە لە ئەم ژنە دەبێت، هەر دەبێت ١٠- ٢٠ ساڵێك ماوە هەبووبێت کە دەکاتە ساڵانی ١٣٦٩- ١٣٧٩، بەڵام لە سەرچاوەی (کرد، ترك، عرب؛ سي. جي. أدموندز، ترجمة: جرجیس فتح الله، مطبعة التایمس، بغداد، ١٩٧١، ص١٧٠.) وا هاتووە کە ساڵی لەدایك بوونی سوڵتان ئیسحاق دەکاتە ١٢٧٢، واتە

گۆرانە.))[1] سەبارەت بە سەید ئیسحاق و بڵاوبوونەوەی ناوی کاکەیی، چیرۆکی جۆراوجۆر دەگێڕنەوە. ناوەڕۆکی یەکێك لە ئەو چیرۆکانە واباس دەکات کە ((ڕۆژێك شێخ عیسا تەمەنی زۆر چووبووە سەر و پیر بووبوو، سێ دەروێشی پیاوچاکی "ئەرەنلەر"[2] هاتنە لایی و داوایان لێ کرد کە ژنێکی تریش بخوازێت. شێخ هەوڵیدا لەبەر پیریی، خۆی لە ئەم کارە بپارێزێت، بەڵام سەرەنجام ڕازی کرا و خۆشحاڵی خۆی بۆ مارەکردنی "دایرەك"[3] کچی میر محەممەد[4] سەرۆکی جافەکان دەربڕی... و دوای ساڵێك لە مارەکردنەکە، لە ساڵی "١٢٧٢ز"دا، دایرەك خاتوون، سەید ئیسحاقی هێنایە ئەم دنیایەوە. ساڵەکان تێپەڕین، سەید ئیسحاق گەورە بوو، نوێژگە کۆنەکەی سەید عیسا پێویستی بە نۆژەنکردنەوە بوو. کاتێك کاریتەیان بۆ دارەڕاکردن بردە سەر دیوار، کاریتە قوڵە بوو و

---

لەنێرەدا نزیکەی یەك سەدە جیاوازی هەیە کە ئەمەش بۆ سەلماندنی زانستییانە پشتی پێنابەسترێت، ئەمە جگە لە ئەوەی کە هاتنی دوازدە کوڕ یان حەڤدە کوڕ لەلایەن یەك ژنەوە وەك لە (تاریخ السليمانية و انحائها، سەرچاوەی پێشوو...، ص٢١٩.)دا هاتووە ((شێخ عیسێی برای ژنەکەی دێنێتەوە و ١٢ کوڕی لێی دەبێت بە ناوەکانی: عەبدولکەریم، محەممەد، سادق، میر سوور، وساڵە دین، سوڵتان ئیسحاق، کەماله دین، جەماله دین، عەبباس، بایەزید، حسێن، حەسەن، و هەریەکە لە ئەمانە بە پارێزگای سلێمانیدا بڵاودەبنەوە.)) کە دیارە ئەمەش شتێکی ئاڕادەیەك ئاسان نییە و پێدەچێت لەڕوی کاتەوە سوڵتان ئیسحاق لە ژنی دووەم بێت کە لە تەمەنێکی پیریدا هێناویەتی. بەهەرحاڵ ئەم جیاوازییانە ناکەنە ئەوەی کە کەسی سوڵتان ئیسحاق لە ئەم بنەچە و بنەڕەتە دابڕین، چونکە تێکڕای سەرچاوەکان لە ئەم بارەوە کۆك و تەبان.

١- کورد تورك عەرەب، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٢٦.

٢- Erenler (ئیدمۆن)

٣- بە وتن (دایرە) خاتوونیان پێ دەوت (ئیدمۆن)، بەڵام ڕاستییەکەی (دایەراك)ـە نەك (دایرە یان دایرەك) کە نازناوەکەشی (ڕەزبار)ە.

٤- ئەم ناوە لای مینۆرسکی بە (حەسەن بەگی جەلالە) هاتووە. بڕوانە (بنچینەکانی کورد و چەند وتارێکی کوردناسی، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٣٨.) هەرچی کاکەییەکان خۆشیان هەیە، پێیان وایە دایەراك کچی حوسێن بەگی جافە.

نەدەگەیشتە سەر دوو لای دیوارەکان. ئیسحاق دیتی بابی ناڕەحەتە، لەبەر ئەوە بەپەلە چووە سەر دیوارەکە و سەرێکی کاریتەکەی گرت و بەبابی یان کاکی وت: "کاکە بیکێشە!" بە ئەم جۆرە، کاریتەیان کێشا و خستیانە سەر دیوارەکە[1]، ئیسحاق چونکە لاوێکی جوان و خۆش سیما بوو، بابی زۆری خۆش دەویست و ئەو کەسانەش کە موعجیزەی ئەویان دیتبوو، ڕێزیان لێ دەگرت، بەپێچەوانەوە براکانی بەتەواوی ڕەژدیان پێ دەبرد و لە قاویان دەدا کە داستانی ژن هێنانی بابیان لە تەمەنی پیریی و بەساڵاچووییدا، ساختەی دەستی دەروێشەکانە، ئیسحاق لە ئەو دەروێشانەیە و برای ئەوان نییە. ئیسحاق لە ئاکامی ئەو کردەوە قین لە دڵانەیە، براکانی بەجێهێشت، چووە هەورامان و جێگەی نوێژگە "نیازگە"یەکی ساز کرد. ئەم ئایینە دەروونییەی کە سەید ئیسحاق بناغەی دارڕشت[2]، لە دەوروبەری ساڵی ٧١٦ی هیجری قەمەری "١٧- ١٣١٦ ز"دا، لە ئەم جێیە دامەزرا.))[3]

---

١- دەڵێن: کاریتەی مزگەوتی بەرزنجە، ئەو کاریتە سەرسوڕهێنەرەیە. (ئیدمۆنز)

٢- ئەوەی ڕاستیی بێت، سەید ئیسحاق بناغەی ئەم ئایینەی دانەڕشتووە، بەڵکو بناغەدارەکەی بۆ شاخۆشینی لوڕستانیی دەگەڕێتەوە و دواتر سەید ئیسحاق هاتووە ڕژێمی بۆ داناوە و کاکەیشی پێ وتووە.

٣- کورد تورک عەرەب، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢٢٨- ٢٢٩.



کۆمەڵێک لە کاکەییەکانی دەڤەری گەرمیان

لە دوای کۆچی دوایی "شێخ عیسێ" ئیتر کوڕە گەورەکەی "عەبدولکەریم" دەست بە ئیرشادکردن دەکات و بەچەند بنەچە و نەوەیەک لە ئەمەوە، دەگاتە سەر سەید باباڕەسوڵی گەورە، ئەویش بە ئەم شێوەیە ((شێخ بابا ڕەسوڵی گەورە، کوڕی سەید عەبدی دووەمە. عەبدولڕەسوڵ کوڕی سەید عەبدە و سەید عەبد کوڕی قەلەندەرە. قەلەندەر کوڕی سەید عەبدە و سەید عەبد کوڕی عیسێی ئەلئەحدەبە. عیسێی ئەلئەحدەب کوڕی حسێنە و حسێن کوڕی بایەزیدە و بایەزیدیش کوڕی عەبدولکەریمە.))[1] هەرچی سەید بابا ڕەسوڵی گەورە (١٥٥٨-١٦٤٦)یش هەیە وەها دەگێڕنەوە کە حەڤدە کوڕی هەبووە ((کە زۆرترین ساداتی

---

١- الشیخ معروف النودهي البرزنجي، محمد الخال، دار مطبعة التمدن، بغداد، ١٩٦١، ص٧٢، کە ئەمیش لە (بحر الأنساب ورسالة سادات البرزنجة للسید عبدالقادر محمد، سنة ١٣٧٥هـ- ١٩٥٦م)ی وەرگرتووە. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە لە ڕیزبەندی بابەڕەسوڵی گەورەوە تا قەلەندەر، ناتەواوییەک هەیە کە لە دەقەکەی لای خاڵدا وەها هاتووە (بعد بایزید بن عبدالکریم، فحسین بن بایزید، فعیسی الأحدب بن السید حسین، فالسید عبد بن عیسي الأحدب، فالسید قلندر بن عبد السید، فالسید عبدالرسول بن عبد السید فالسید بابا رسول الکبیر بن عبد السید الثاني)

بەرزنجە، دەچنەوە سەر ئەمان، وەك: ساداتی سەرگەڵو کە دەچێتەوە سەر سەید عەبدولسەمەد کە پیاوی ناوداری وەك: زانا، سەید ئەحمەدی سەرداریان تێدایە کە خەلیفەی مەولانا خالید بووە.))[1] هەروەها شێخ مارف نۆدێییش دەچێتەوە سەر ئەم بەرەبابە، هەروەك خۆی لە هۆنراوەیەکیدا بەزمانی عەرەبی ڕاستی ئەمەی دەرخستووە.[2]

بەکورتی دەتوانین چەند سێریمۆنیایەك کە مینۆرسکی لای ئەهلی هەق دیاری کردوون[3] بکەینە خاڵی هاوبەشی نێوان هەقە و ئەهلی هەق کە بریتین لە ئەمانە:

---

١- الشيخ معروف النودهي البرزنجي، سەرچاوەی پێشوو...، ص٧٢- ٧٣.

٢- کاتێك لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:

ان ينتسب محمد عنه عفا
بفضله مولاه فابن مصطفى
من أحمد الشهير في القتال
نجل (محمد أبي المعالى)
ابن(علي) ذي السجايا ولد
(عبد الرسول) نجل(عبد السيد)
وهو فتى (عبد الرسول) ولد
(قلندر) سليل (عبد السيد)
عيسى الحسين ابن أبي يزيدا
عبدالكريم لم يزل حميدا
والده قطب غدا رئيسا
في عصره للأولياء عيسى
أول من أقام في برزنجه
يرشد بالحجة والمحجة

بڕوانە (الشيخ معروف النودهي البرزنجي، سەرچاوەی پێشوو...، ص٧٨.)

٣- بنچینەکانی کورد و چەند وتارێکی کوردناسی، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٥٤- ١٥٦.

((یەکەم: زۆر کەم باس لە نوێژی کەسیی دەکەن، کەچی بەپێچەوانەوە زۆر بەتوندی گرنگی بەو کۆبوونەوانە (جەم) دەدەن کە چارەسەری هەموو ئاستەنگێکی تێدایە. بایەخێکی گەورە بە ژیانی کۆلەکتیڤی دەدەن و کۆبوونەوەکان لە کاتی دیاریکراو و ڕووداوگەلی گرنگدا، دەبەسترێن.

دووەم: دەروێشەکان دەکەونە حاڵەتی لە جیهان دابڕان و بێئیحساسی، بەشێوەیەک کە دەتوانن لە سەر پشکۆی ئاگریش بڕۆن یان بەدەست بیگرن.

سێیەم: لایەنی پێویستی کۆبوونەوەکان بریتییە لە بەخشش و قوربانییەکان، نەزر و نیاز "واتە: بەخششی برژاو و نەبرژا و بە ئاژەڵی نێرینەشەوە، هێلکە، مەڕ، کەڵەشێر" بۆ قوربانی دانراون، یان خێر و خزمەت کە بریتین لە خواردنی لێنراو یان ئامادەکراو، وەک: شەکر، نان... هتد

چوارەم: بەمەبەستی چاککردنی ئەخلاقی، پێوەندی تایبەتی لە نێوان یەک پیاو یان یەک ژندا کە بەبرا و خوشک دەناسرێن، دەبەسترێت.))[1]

جگە لە ئەم خاڵە هاوبەشانەی کە مینۆرسکی بۆ ئەهلی هەقی دیاری کردوون و دەتوانین بە هەمان تایبەتمەندی هەقەکانیشیان دابنێین، چەند خاڵێکی تریش بکەینە خاڵی هاوبەشی نێوانیان، وەک:

١- هەردوولا بنەچەیان دەچێتەوە سەر شێخ عیسێ و شێخ موسێی بەرزنجە. بەجۆرێک کە ((شێخ مەحموود کە دوای جەنگی ١٩١٤-١٩١٨ حوکمداری "پاشای کوردستان"ی ڕاگەیاند، دەی وت: لە دوانزەهەمین وەچەی برای سوڵتان سوهاک

---

١- فرقان الأخبار١، ٧٤ (مینۆرسکی)، بەڵام لای کاکەییەکان نیاز، میوە و نوقوڵ و نەبات دەگرێتەوە و ئەمانە لە ڕێگەی جەمەوە دەبەخشرێتەوە، بەڵام برژاو و هێلکە و مەڕ و ئاژەڵ و پەلەوەری مێینە، بە قوربانی دانانرێت.

کەوتووەتەوە. لە کەرکووک دەستنووسێک هەیە کە بنەچەناسی généalogie دوور و درێژی ئەم بنەماڵەیەی تێدایە.))[1]

تۆرەمەنامەی بەرزنجە کە لە لایەن (ئیدمۆنز)ەوە کێشراوە*

---

1- بنچینەکانی کورد و چەند وتارێکی کوردناسی، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٥٤- ١٥٦.

*- ئەم تۆرەنامەیە لە کتێبی (کورد، تورک، عەرەب، سەرچاوەی پێشوو...)وەوە وەرگیراوە.

## لقەکانی بنەماڵەی بەرزنجی*

٢- لە بنەڕەتی نهێنی پاراستن و نەچوونە دەرەوەی زانیاری لە سەر ڕێباز و تەریقەت و هەر شتێکی تری تایبەت بە خۆیان. ڕێبازی هەقە، لە ئەم لایەنەوە هەروەکو ڕێبازی ئەهلی هەق، (نهێنی پاراستن)ی تێیدا بە مەرج وەرگیراوە. ئەم نهێنیی پاراستنەش وەك دواتر باسی دەکەین بووەتە هۆی ئەوەی کە قسە و قسەلۆك و ناتۆرەیان شوێن بکەوێت، تەنانەت شاعیرێکی گەورەی وەك (شێخ

*- هێڵە ڕاستەکان پیشاندەری تۆرەمەکانە و هێڵە پچڕەکانیش دەستاودەستکردنی تەریقەتەکەن. ئەم هێڵکارییە، لە کتێبی (ئاغا، شێخ، دەوڵەت، سەرچاوەی پێشوو...)ەوە وەرگیراوە.

ڕەزای تاڵەبانی)[1] لە ئەم ناووناتۆرانە بێدەنگ نەبووە و هەجوی کاکەییەکانی کردووە[2].

٣- لە ناو بەشێکی هەر یەکەیاندا، جۆرێك لە عیبادەت یان خواردن و کێشانێك قەدەغە کراوە[3].

٤- بە شێوەیەکی گشتی پێڕەوی لە تاك ژنێتی دەکەن.

٥- نزیکی ناوی هەقە لە هەردووکیاندا.

٦- گێڕانەوەی موعجیزە نواندنی سەرۆکەکانیان.

٧- هاوبەشی لە بنەڕەتەکانی (پاکوتەمیسی، ڕاستی، خۆبەگەورە نەزانین و بەخشندەیی)

بەڵام هەموو ئەمانە ناکەنە ئەوەی پێمان وابێت، نەقشبەندییەکانی سەرگەڵو یان کۆمەڵی هەقە، بەشێك بن یان زیندووکەرەوەی ئایینی ئەهلی هەق بن، یان پێمان وابێت کە نەقشبەندییەکان بەشێوەیەکی گشتی ناوبەناو لە ئەم شێوە

---

١- بنەماڵەی تاڵەبانییەکان بەپێی باوەڕی مێژوونووسی بەناوبانگ (محەممەد ئەمین زەکی) بێت، بنەچەیان دەچێتەوە سەر دانیشتوانی هەرێمی سووورداشی خۆرئاوای شاری سلێمانی. شێخ ڕەزا، سالی (١٢٥٣ك) لە دێی (قرخ)ی نزیك چەمچەماڵ لە دایك بووە و لە سالی (١٩٠٩ یان ١٩١٠ز) کۆچی دوایی کردووە.

٢- دیارە ئەم هەجوەی لە کاتێکدا وتووە کە ناکۆکی لە نێوان عەشیرەتی تاڵەبانیی و کاکەییدا هەبووە، بەڵام ئەوەی کە لە نێرەدا جێگەی سەرنجە، جیاوازی ئەم هەجوەیە لەگەڵ ئەو هەجوانەی کە لە سەر عەشیرەتەکەنی: داوودە و هەمەوەند و جەباری، وتونی؟! بۆ زیاتر، بڕوانە (شێخ ڕەزای تاڵەبانی، د. مکرم تاڵەبانی، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل١١٧- ١١٩.)

٣- حەمەسوورییەکان وەك کۆمەڵێکی جیابووەوە لە کۆمەڵی هەقە، جگەرەیان نەکێشاوە و چایان نەخواردووەتەوە، لای ئانەشبەگییەکانی سەر بە ئەهلی هەقیش، ڕۆژووگرتن و جگەرەکێشان نەبووە. بڕوانە (چەند باسێك دەربارەی ئەهلی هەق، "م. ئاجەریان، ف. مینۆرسکی، د. محەمەد موکری، ژ. م. کرامێرز" وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: نەجاتی عەبدوڵڵا، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٤٩.)

بزووتنەوانەیان بۆ ئەوە بەرپا کردبێت تا گەڕانەوە لە عورف و عادەتەوە بۆ سەر ڕێبازی شەرعی، یان لە ڕێبازی شەرعییەوە بۆ سەر عورف، بهێننە دی، هەروەکو چۆن (محەممەد عەلی سوڵتانی) وابیری لێدەکاتەوە و دەنووسێت ((نەقشبەندیی و عەلەوی، ناوبەناو بە بزووتنەوەیەکی ئایینی گەڕانەوەیەکیان هەبووە لە عورف و عادەتەوە بۆ ڕێبازی شەرعیی یان لە ڕێبازی شەرعییەوە بۆ عورف و عادەت.))[1] هەروەها ناوبراو پێی وایە کە ((ئەگەرچی بەهۆی ساردبوونەوە و دابڕانی چەند سەد ساڵەوە، بزاڤی هەقە سەربەخۆییەکی پێکهاتەیی لەگەڵ بنەما و ڕێورەسمی دێرینی عەلەوییە توندڕەوەکان "ئەهلی هەق= ئال هەق"، پەیدا کرد، بەڵام وەرگێڕاو و ژیاندنەوەی ئایینی پردبوەرییە و پەیوەندییەکی ڕیشەیی و مێژوویی و پتەوی لەگەڵ مەکتەبی سوڵتان ئیسحاقدا هەیە.))[2] بەڵام پێمان ناڵێت کە ئایا ئەم پەیوەندییە ڕیشەیی و مێژووییە پتەوە لە کوێدایە و بۆچی لە ئەم کات و شوێنەی مێژوودا، ئەم پەیوەندییە هاتە ئاراوە و بۆچی ڕێکەوتی کات و سەردەمێکی تر نەبوو؟! هەروەها پێمشان ناڵێت کە چۆن ئەم پەیوەندییە، لە پەیوەندیی نێوان لێکچوونی هەر ئایین و ئایینزایەك، لە سەر یەکتریی گەورەترە؟!

---

١- ڕاپەڕینی عەلەوییەکانی زاگرۆس یا لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە سەر ئەهلی حەق، سەرچاوەی پێشوو...، ل٣١- ٣٢.

٢- هەمان سەرچاوە، ل٢٨١.

## باسی سێیەم:

### پەیوەندی هەقە و بەهائییەکان

بەهائییەکان بزووتنەوەیەکی ئایینیی و کۆمەڵایەتی سەدەی نۆزدەیە کە لە سەر دەستی باب[1] و بەهائوڵڵا[2] دامەزرێنراوە. باب و لایەنگرانی، چەند بڕوا و ڕێوشوێنێکیان گرتووەتەبەر کە بوونەتە جێی تێڕامان و سەرزەنشتکردنی دەوروپشتیان، وەك بڕوابوونیان بە خۆشەویستیی و برایەتی، داواکردنیان بۆ فێربوونی سەرەتایی بەشێوەیەك کە گشتیی بێت و هەمووان بگرێتەوە. ئافرەت لە ناو بەهائییەکاندا ڕۆڵی زۆرتر و سەربەستانەتری هەبووە، لە خەزانەی گشتی یارمەتی هەژارانیان داوە و پێیان وابووە کە خواپەرستی لە ژێر سایەی پاداشت و

---

١- ((باب، ناوی "عەلی محەممەد"ە و لە شاری شیرازی سەر بە ئێران لەساڵی ١٨١٩دا لەدایك بووە. باوکی هەر زوو دەمرێت و پەروەردەکردنی دەچێتە لای خاڵی. لەتەمەنی پازدە ساڵییەوە لە ژێر سەرپەرشتی خاڵیدا سەرگەرمی کاری بازرگانی دەبێت و بە خووڕەوشتی چاك و بێگەردەوە ناوبانگ دەردەکات. پەیڕەوی لە واجبی شەرعی نوێژ و ڕۆژوو و ئەو واجبە شەرعییانەی تر، نەکردووە کە لە سەر مرۆڤ دانراوە کە پیادەیان بکات. لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا ژیانی هاوسەری پێکهێناوە و کوڕێکی بووە کە پێش ساڵێك لە بانگەوازەکەی١٨٤٢ کۆچی دوایی کردووە. ساڵی ١٨٥٠ باب بەهۆی بیروبۆچوونەکانیەوە دەکوژرێت.)) بڕوانە (بهاءالله و العصر الجديد مقدمة لدراسة الدين البهائي، د. جون اسلمنت، الطبعة الأولى، مؤسسة النشر البهائية، ١٩٧٠، ص٢٢- ٣٣.)

٢- ((بەهائوڵڵا: ناوی میرزا حسەین عەلییە، بە "بەهائوڵڵا" ناوی دەرکردووە. لە بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار و خاوەن سامان لە ساڵی ١٨١٧ لە دایك بووە. پلەی خوێندەواری زۆر نەبووە، بەڵام وریا و زیرەك بووە. لە کاتی بانگەوازەکەی بابدا، تەمەنی ٢٧ ساڵان دەبێت و پشتگیرییەکی تەواوی لێدەکات و لەبەر ئەمەش دوو جار زیندانی دەکرێت.)) (بهاءالله و العصر الجديد مقدمة لدراسة الدين البهائي، سەرچاوەی پێشوو...، ص٤٢- ٤٦.) تا دواتر بەرەو ئەستەنبوڵ دوور دەخرێتەوە و دواتریش بۆ "عەکا" و تا کۆتایی لە ١٨٩٢دا ژیانی لە ئەوێ بەسەر دەبات.

سزادا ناكرێت. جا لەبەر ئەوەی کە ئەم بیروبۆچوونانە لە نێرانی ئەو کاتانە و ناوچەکەشدا ئەبووە ((بە سڕینەوەی شەریعەت و بەحەڵاڵکەرانی شتە حەرامکراوەکان تاوانبارکراون و... دوای ململانێیەکی زۆر، بەرامبەر بە هەندێك لە یاسا شەرعییەکانی ئایین، وەستایەوە و بڕیاری سڕینەوەی ژمارەیەك لە دەقە شەرعییەکانی دا، وەك: ئەو کاروبارانەی پەیوەندیدارن بە ژنەوە، دوای ئەمەش سڕینەوەی ئەو کاروبارانەی کە پەیوەندیدارن بە عیبادەتەوە، وەك ئەوەی کە گیانی ڕۆژگار بەپێی سەرنجی ئەو، لەگەڵ کاتەکانی نوێژکردن و ڕۆژووگرتن و حەجدا نایەتەوە.))[1] لەبەر ئەمانە ژیانی هەر یەکە لە باب و بەهائوڵلا لە لایەن دەسەڵاتەوە ڕووبەڕووی مەترسی بوونەتەوە و ((بەوە تاوانبار کران کە دەستی بێگانە لە پشتیانەوە هەبێت و بۆ ئەو ئامانجانە کاربکەن کە پەیوەندیان بە مەسیحییەت و یەهودییەتەوە هەبێت لە دژی ئیسلام، بۆیە ناوی بزووتنەوەی تێکدەر و ڕووخێنەریان لێنان، کە ئەوەی ڕاستیی بێت هۆکاری ڕاستەقینەی دەرکەوتنی بابیی و بەهائییەکان ڕەخنەگرتن بوو لە بیری هەتاهەتایی شەریعەت بە هەموو بەشەکانیەوە و دەیەویست بەش بەش نوێکردنەوە لە بیری ئایینی و ڕێگا فیقهییەکەیدا، بهێنێتە ئاراوە.))[2] لە ئەم پێناوەشدا، ئەو هەوڵانەی کە دەیانگرتەبەر، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر ڕقی بەرامبەریان ئەستوورتر دەکرد و زۆرتر دەکەوتنە دژایەتییکردنیان، بەتایبەت ئەو کاتەی کە کەوتنە گۆڕانکاری لە بواری عەقایدییەوە.[3]

---

١- الأديان و المذاهب بالعراق، رشيد الخيون، منشورات الجمل، الطبعة الثانية، ٢٠٠٧، ص٤٧٢.

٢- هەمان سەرچاوە، ص٤٩٠.

٣- بۆ زیاتر بڕوانە (الأديان و المذاهب بالعراق، سەرچاوەی پێشوو...، ص٤٩٩- ٥٠٠.)



وێنەی ئەو کەلوپەلانەی کە بەهائوڵڵا لە سلێمانی بەکاری هێناون*

بەهائوڵڵا بەهۆی پشتگیری لە باب، زیندانی دەکرێت و دواتر بەبڕیاری شای ئێران ڕەوانەی ئێراق دەکرێت و لەساڵی ((١٨٥٣ کە تەمەنی ٣٧ ساڵ دەبێت، دەگاتە شاری بەغداد کە لە ئەو کاتانەدا لەژێر دەسەڵاتدارێتی عوسمانییەکاندایە.))[١] و لە ئەو شارەدا دادەنیشێت. پاش ماوەیەك و بەهەر هۆیەك

*– ئەم وێنەیە لە کتێبی (عنقای بقا در قاف و فا، سەرچاوەی پێشوو...)وەوە وەرگیراوە.

١– هەمان سەرچاوە، ل٧٩.

بێت، لەساڵی ((١٨٥٤دا دەگاتە سلێمانیی و لە شاخەکانی سەرگەڵو و لە ئەشکەوتەکاندا جێگیر دەبێت و ژیانێکی سادە بەسەردەبات و بە دەستێك جلی دەروێشانە و کەشکۆڵێکەوە و دوور لە ئاوەدانی و بەتەنها ژیان بەسەر دەبات و بەناوی دەروێش محەممەدەوە خۆی دەناسێنێت.)) هەروەك خۆیشی لە (قرن بدیع)دا ئەم تەنهایی و ژیانەی خۆی باس کردووە.[١]



**ئەو ئەشکەوتەی کە (بەهائوڵلا– میرزا حسەین عەلی) لە سەرگەڵو خۆیی تێدا شاردووەتەوە**

---

١– بەهائوڵلا لە ئەم بارەیەوە تەنها ئەوەندە دەنووسێت (وبالاختصار، ماذا نقول من البيان بعد هذا ممّا لا طاقة للإمكان أن يحتمله، إن كان هناك إنصاف؟ إنّ هذا العبد في أوائل أيّام وروده في هذه الأرض، لمّا رأى علائم الحوادث المقبلة، اختار المهاجرة قبل وقوعها، وهام في فيافي الفراق. وقضيت اثنين من السّنين وحيداً في براري الهجر فجرت العبرات من عيوني كالعيون، وسالت بحور الدّم من قلبي. فكم من ليال لم أجد قوتاً، وكم من أيّام لم أجد للجسد راحة. ومع كلّ هذه البلايا النّازلة، والرّزايا المتواترة، فو الّذي نفسي بيده كان كمال السّرور موجوداً، ونهاية الفرح مشهوداً. حيث لم يكن عندي خبر من ضرّ أحد أو نفعه، وصحّته أو سقمه. كنت مشغولاً بنفسي، نابذاً ورائي العالم وما فيه. وما كنت أدري أنّ شرك قضاء الله أوسع من ميدان الخيال، وسهم تقديره مقدّس عن التّدبير. فلا نجاة لأحد من شرك قضائه، ولا مفرّ له إلا بالرّضاء في إرادته.) بروانە (كتاب الايقان، من المنشورات دار النشر البهائية في البرازيل، ١٩٩٧، ص٢١٠.)

دیاره هۆی هاتنی بەهائـەللا بۆ سلێمانیی و ناوچـەی سـەرگەڵو، بۆ دوورکەوتنەوە بووە لە نارەزایەتیی و حکومەت و ئەو کەسانەشی کە ئەمیان بە نەیاری بەرژەوەندییەکانیان زانیوە، بۆیە ژیانی دەرویشایەتیی و دوور لە ئاوەدانی هەڵبژاردووە و زۆر کەم تێکەڵاوی خەڵکی بووە، تەنانەت باس لە ئەوە دەکرێت کە سەردانی سەرگەڵوشی نەکردووە کە لە ئەو کاتانەدا نزیکترین ئاوەدانی بووە لێوەیی و مەگەر شوانێك هاتبێت چۆرە شیرێکی لێوەرگرتبێت و چەند قسەیەکیان پێکەوە کردبێت کە لە ئەو کاتانەدا ((سەرگەڵو نزیکەی سەد ماڵێکی لێبووە و دانیشتووانەکەشی نزیکەی ٥٠٠ کەسێك بووە.))[1] تەنانەت هۆی بڵاوبوونەوەی دەنگوباسی بەهائوڵلا لەلایەن خەڵکانی سلێمانییەوە، بۆ رێکەوتی سەردانی شێخێك دەگەرێتەوە کە ((لە سەرگەڵو باخێکی دەبێت و رۆژێك کاتێك لە باخەکەیدا دەخەوێت، لە خەونیدا دەنگێکی نادیار داوای لێدەکات کە بچێتە بەشی سەرەوەی شاخەکە و سەیری نوری پەروەردگار بکات، ئەمیش کاتێك بەخەبەر دێت، بە شاخەکەدا سەردەکەوێت و لەرێ گوێی لە دەنگی نزا و پارانەوەی بەهائوڵلا دەبێت!! شێخەکە لێی دەچێتە پێشەوە و خەونەکەی بۆ دەگێرێتەوە... تا دواتر بەهائوڵلا رێگەی دەدات جارجار سەردانی بکات و برێك نانی بۆ بهێنێت.))[2] ئەم هەواڵەش سەرزمان دەکەوێت و بەشاردا بڵاودەبێتەوە، تا (شێخ ئیسماعیل) ((داوای لێدەکات کە لە سلێمانییدا و لە خانەقای مەولانادا دابنیشێت، بەهائوڵلاش بە ئەم داوایەی رازی دەبێت و لەیەکێك لە ژوورەکانی بەشی سەرەوەیدا دادەنیشێت.))[3] بەڵام هەر بە شێوەی گۆشەنشین و دابراو

---

١- هەمان سەرچاوە، ل١٢٤.

٢- هەمان سەرچاوە، ل١٢٢.

٣- هەمان سەرچاوە، ل١٢٤.

لەخەڵکی دەمێنێتەوە و ئەگەرچی چەندین کەسایەتیی ئایینی سەردانی ئەم دەکەن، بەڵام ئەم سەردانی کەم کەس دەکات و تەنانەت گوێ بۆ وتاری ڕۆژانی ڕەمەزان ڕاناگرێت و ناچێتە دانیشتنە ئایینییەکانیشەوە، هەروەك ((یەكێك لە کوڕەکانی شێخ محەممەدی ئەربیللی بە باوکی دەڵێت: بۆچی بەم مانگی ڕەمەزانە ئەم پیاوە-مەبەستی بەهائوڵلایە- نایەتە دەرەوەوە؟ باوکی دەڵێت: لێی گەڕێن...))[1] سەرەڕای هەموو ئەمانە، بەهائوڵلا تا ساڵی ١٩٥٦ لە سلێمانی دەمێنێتەوە و دواتر بۆ بەغدا دەگەڕێتەوە.

بێگومان لێکچوواندن لە نێوان هەندێك لە ئەو بیروبۆچوونانەدا هەیە کە لەنێوان هەر یەك لە بنەڕەتی بیری هەر یەکەیاندا هەیە، بەڵام ئەمانە ناکاتە ئەوەی بوترێت: هەقەکان ڕاستەوخۆ لەژێر کاریگەری بیروباوەڕی بەهائییەکاندان و ئەم کاریگەرییەش لە ڕێی بەهائوڵلاوە وەرگیراوە کە لە سەرگەڵو ماوەتەوە؟ چونکە شێخ عەبدولکەریم لە ساڵی ١٨٧١ یان ١٨٩٢دا لە دایك بووە، بەڵام بەهائوڵلا لە ساڵی ١٨٩٢دا کۆچی دوایی کردووە، هەروەها شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە لە ساڵی ١٩٢٠ەوە ڕێبازی هەقەی داناوە، بەڵام بەهائوڵلا لە ساڵانی ١٨٥٤-١٨٥٦ چووەتە سەرگەڵو، واتە: بەهیچ شێوەیەك ئەم دوو کەسە یەکتریان نەبینیوە و هیچ نووسراو و بەڵگەنامەیەکیش لە ئارادا نییە ڕاستی ئەوە بسەلمێنێت کە شێخ عەبدولکەریم کەوتووەتە ژێر کاریگەری بیروباوەڕی بەهائییەوە. هەرچی ئەو ماوەیەش هەیە کە بەهائوڵلا لە سەرگەڵو بووە، شەدەڵە جێگە و ڕێگەیەکی وەهای نەبووە کە بێگانە تێیدا دابنیشێت و بمێنێتەوە و لە ئەو کاتانەشدا خانەقای شەدەڵە دروست نەکراوە، چونکە ((حاجی شێخ مستەفای باوکی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، لە سەرەتای سەدەی بیستدا... خانەقا و خانووی لێ

---

[1] - بۆ زیاتر، بڕوانە (عنقای بقا در قاف و قا، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢١١- ٢١٢.)

دروست کردووه.))[1] هیچ بەڵگەیەکی وەهاش لەبەر دەستدا نییە کە ئەوە دەربخات پەیوەندییەکە لە ڕێگەی ئەو بەهائییە ئاوارانەوە بووبێت کە لە کەرکووك یان سلێمانی دانیشتوون. واتە نە لەسەردەمی بەهائوڵڵا و نە لە سەردەمی دوای خۆشیدا، هیچ پردێك بۆ گەیشتن و کاریگەری بەهائییەکان لە سەر هەقەکان لە ئارادا نییە و ئەوەی کە هەیە تەنها وەك پەیوەندی نێوان چەندین ڕێباز و بزووتنەوە و بیرۆکەیە کە لە مێژوودا وا ڕێککەوتووە کە دوو بیروڕا وەك یەکتر بووبێتن.

---

١- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٩٩.



**وێنەی ئاوارە بەهائییەکانی نیشتەجێی شاری سلێمانی لە ساڵی ١٩٤٣***

---

*– ئەم وێنەیە لە کتێبی (عنقای بقا در قاف و فا، سەرچاوەی پێشوو...)وەوە وەرگیراوە.



**وێنەی ئاوارە بەهائییەکانی نیشتەجێی شاری کەرکوک لە ساڵی ١٩٤٣***

---

*- لە هەمان سەرچاوەوە وەرگیراوە.

## باسی چوارەم:

## بەربەرەکانێکردنی هەقەکان

بەربەرەکانێکردنی هەقەکان مێژوویەکی کۆنی هەیە و دەتوانین بەپێی جۆری ڕووبەڕووبوونەوەکان، بەچەند شێوەیەك پۆلێنی بکەین، کە بە دڵنیاییەوە هەر یەکەیان کەم و زۆر پەیوەندی بە ئەوی تریانەوە هەیە.

**١- ڕووبەڕووبوونەوە وەك ئایین:**

سەرەتای ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە، بۆ دژایەتیکردنی تەریقەتی نەقشبەندیی دەگەڕێتەوە، هەروەك لە پێشتردا باسی لێوەکرا، جا بە ئەو پێیەشی کە ڕێبازی هەقە لە تەریقەتی نەقشبەندییەوە داهێنراوە و لە ئەو تەریقەتەوە سەرچاوەی گرتووە، نەیارانی تەریقەتەکە بوونەتە نەیاری ڕێبازی هەقە و بەهەمان چاوەوە سەیری ڕێبازەکەیان کردووە، تەنانەت لە هەندێ نووسیندا بەیەکەوە باس کراون و جیاوازی لە نێوانیاندا نەکراوە، هەروەك چۆن (ئیدمۆنز) دەنووسێت ((نەقشبەندییەکانی کوردستان -مەبەستم جووتیارانی لادێ و شوێنە دوورە دەستەکانە نەك ئەوانەی کە لە شارەکاندا دەژین و خوێندەوارن- هەنێ جار کاری سەیر و سەمەرە دەکەن. بێگومانم لە ئەوەی کە ئەم کارانە لە گوندە دوورە دەستەکانی نێوان چیاکانی سووورداش و مەرگەدا دەکرێن و پەیوەندییان بە دنیای دەرەوەیانەوە نییە و لەگەڵ مەئموورەکانی حکومەتدا کەمتر ڕووبەڕوو دەبنەوە و ئەم کردەوانە دابونەرێتێکی ناوچەیین. من بۆ یەکەم جار و دوای چەند ساڵێك مانەوەم، لە ساڵی ١٩٣٢دا بە ئەم کارانەم زانی، کاتێك یەکەیەکی پۆلیس بۆ ئاگارکردنەوەی ژمارەیەك لە خەڵکی گوندی هەڵەدن- کە چوار میل لە

سەرگەڵووەوە دوورە و موڵكی شێخ مەحموود بووە- بە فەرمانی میری دەچنە ئەوێ و دوای گەڕانەوەیان باس لە ئەوە دەكەن كە ژمارەیەك لە ژن و پیاویان بینیوە بەیەكەوە لە حەوزی مزگەوتدا مەلەیان كردووە و هەندێ كاری سەیری تریشیان بینیوە. بەرپرسانی پارێزگا گومانیان لە ئەو قسانە هەبوو، تاوەك چەند كەسێكی تریش لە قاچاخچییانی توتن هاتن و ئەوانیش وتویانە شتێكی لە ئەم شێوەیەیان لە گوندی سەرگەڵو بینیوە، ئەمانە وتبوویان، چونكە ڕەخنەمان لە ئەم كارەی ئەوان گرتووە، شەڕیان لەگەڵدا كردوین و لێیان داوین.

لێكۆڵینەوەكانیش پەردەیان لە سەر داستانێكی سەیر لادا.

ئەم تەریقەتە نهێنییە گەلێك ڕێوشوێنی ئایینی پێشێل كردبوو: سۆفیان بینیوە تا سەر سەری ناوەتە پیسایی ئاژەڵەوە و زیكری خوای كردووە. شێوەیەك لە موڵكداریێتی گشتییان هەبووە، لەوانە: موڵكداریێتی گشتی بەسەر ژناندا. گروپی تێكەڵاوی ژن و پیاویان بەیەكەوە بینیوە، پیاویان بینیوە كە بەرگی ژنانەی لەبەردابووە و زێڕ و زیوی بەخۆوە كردووە و دوای خۆرئاوابوون لە دەوری تەپۆلكەكانی نزیك دێ، خولاوەتەوە. لە كاتێكدا كە ژن و پیاو لە حەوزی مزگەوتدا بەیەكەوە مەلەیان كردووە، هەندێ جار لەگەڵ خۆیاندا سەگیشیان بردووەتە ناو ئاوەكەوە - كە دیارە لە ڕوانگەی موسوڵمانانەوە و بەپێی مەزهەبی حەنەفی، سەگی تەڕ حەرامە- قاپ و جامی پڕ لە میزیان بە دەست گێڕاوە. دوای هێرشی تاقمێك لە سۆفی حالگرتوو بۆ سەر مزگەوتی سەرگەڵو و سووتاندنی لاپەڕەیەكی قورئان، شێخەكان بانگكرانە سلێمانی تا وەڵامی ئەو كارەیان بدەنەوە. ئەوانیش لە وەڵامدا وتویانە ئێمە ئەو كارە مەحكووم دەكەین، بەڵام ئەگەر مورریدێك لە كاتی حالگرتنیدا لە هۆش خۆی بچێت و كارێكی ناشایستە بەرامبەر ئایین بكات، ئەوا بەتاوان دانانرێت، ئەوانیش ئەم وەڵامەیان بەهەند وەرگرت و بەتاوانیان

نەزانی. من ناتوانم ئەم قسانە بەتەواوی بەڕاست دابنێم، بەڵام بێگومانم لە ئەوەی کە ئەم قسانە دوور نین لە ڕاستییەوە. شێوەی هەرە باشی بەرگریکردن لە ئەم ئاکار و کردەوانە، دانانی خوێندنگە بووە لە ئەو جێگانەدا. بەڵام ئەم جۆرە کارانە، لە دەسەڵاتی کارگێڕانی ناوچەدا نەبوو و تا چەند ساڵ ئەو مەترسییانەیان بیردەخستینەوە کە ئایینی هەقە، هاوبیری نوێی پەیداکردووە و چووەتە خاکی دراوسێکانییەوە.))[1] ئەگەرچی لە ئەم یاداشتکردنەدا ئیدمۆنز ئەوە دەڵێت کە ناتوانێت بەتەواوی ئەو قسانە لە سەر هەقەکان بەڕاست دابنێت، بەڵام بۆ زۆرێك لە خوێندەواران و دەسەڵاتدارانی ئەو کاتانە، ئەم شێوە بیروبۆچوونە لە سەر هەقەکان، بووەتە باوەڕ و تەنانەت لە ناو نووسەر و ڕۆشنبیری کوردیشدا دووبارە کراوەتەوە، هەروەك (شاکیر فەتاح) لە هەمان گۆشەنیگاوە لە کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ[2] و لە ژێر ناوی (لێرە و لەوێ)دا دەنووسێت[3] ((هەقەکان: خۆپەرستان

---

١- کرد ترك عرب، سەچاوەی پێشوو...، ص١٨٧- ١٨٩.

٢- کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ: ڕۆژنامەیەکی مێژوویییە کە لە ساڵی ١٩٤٦دا و لە ڕۆژی ٧/١ تا ٨/١٢ بەردەوام بووە و تەنها حەوت ژمارەی دەرچووە و هەفتانە لەڕۆژی دووشەمماندا دەرچووە و لەلایەن مامۆستاکانی خوێندنگای شەوانەوە خوێندراوەتەوە. ئەوەی شایەنی وتنە، شاکیر فەتاح لە ئەم کاتانەدا جێ نشینی (قائمقام)ی چەمچەماڵ بووە، خاوەن و سەرنووسەری ئەم ڕۆژنامەیەش بووە. شاکیر فەتاح لە ئەم شێوە ڕۆژنامەیەی لەپێشتردا و لەساڵی ١٩٤٠دا لەلادێی خورماڵدا بە ناوی (ڕۆژنامەی خورماڵ)ی دەرکردووە و لەساڵی ١٩٤٢دا و لەلادێی (قادر کەرەم) یش بە ناوی (ڕۆژنامەی باسەرە)وە دەرکردووە. کە دواتر ئەم ڕۆژنامانە لەچوارچێوەی کتێبدا چاپ کراوە. بڕوانە (کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٣.)

٣- کە لە دواتردا و لەئەنجامی تێگەیشتن لەئەم بارەیەوە (شاکیر فەتاح) لە ئەم بۆچوونانە پاشگەزدەبێتەوە و ئەو قسەوباسانەی کە سەبارەت بە هەقەکان وتراوە بە دەستی ئاغاکانی پشدەر دەزانێت و دەنووسێت ((ئاغاکانی پشدەر چاویان بڕیبووە داگیرکردنی ئەو گوندانە. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی دوور و درێژدا بۆم دەرکەوت، کە ئەو بەند و باوەی بۆ هەقەکانیان هەڵبەستووە، سەرچاوەکەی لە ئاغاکانی پشدەرەوە بووە!... هۆی ئەمەیش نەك تەنها زەویی و زار دەستکەوتن

و پوول پەرستان هێندە دەستکاری "ئایینی پاکی ئیسلام"یان کرد و بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان، ئەم کوردەوارییە بەسەزمانەیان چەواشەکرد و بەهەموو جۆرە فڕوفێڵێك ڕوتاندویانەتەوە، دواییەکەی ئەم تەکیە و خانەقا و پرچ و ڕیش و تەپڵ و دەف و بەشیر سەربڕین و شاپڵیتە خواردن و شێخ و خەلیفەو دەروێش و مریدەیان، پەیداکرد و "ڕێڕەوی نەقشبەندیی"یان گۆڕی و خستیانە شێوەی "ڕێڕەوی هەقە"، وە"ڕێڕەوی هەقە"یش کە تلپەی "ڕێڕەوی نەقشبەندیی"یە، ئەگەر هیچی لێنەڵێین، ئەوە دەڵێین کە بووەتە هۆی بێ کار و فرمانی و گێژ و وێژیی و نەزانی، لەبەر ئەوە یەکێکە لە هەرە دوژمنەکانی گەلی"کورد نەژاد". لەبەر ئەوە پێویستە بە هەموو هێزێکمانەوە کۆشش و خەبات بکەین، ئەمانەی بوون بە هەقە بیانخەینەوە سەر ئایینە پاکەکەی ئیسلام. وەك بۆمان دەرکەوتووە "ڕێڕەوی" هەقە، کە بە ئەم جۆرە بەنهێنی گیراوە و شاراوەتەوە و لە هەقەکان بەولاوە ناهێڵن کەس تێی بگات، چووەتەوە سەر ڕێڕەوی "ئیسماعیلییەکان" کە هەر چییەك خۆشیی پێگەیاندبێت، لایان ڕەوا بووە! شێخەکانیان بەهەشت و دۆزەخیان بۆ دانابوون، لە پێشەوە بەنگ و تریاکیان داوە بەدەروێش و مریدەکانیان تا بێهۆشیان کردوون، ئینجا هەر فرمانێکیان ئارەزوو بووە، پێیان سپاردوون و دەروێشەکان بەکارتێکردنی ئەو بێهۆش داڕووانە، دەست بەجێ فرمانەکانیان بۆ جێبەجێ کردوون. زانست وا پیشان دەدات ئەوەی ئەو جۆرە دەرمانانەی بدرێتێ، هەرچی پێی بڵێیت بەقسەت دەکات، با زیان و نەمانی خۆیشی تێدا بێت، چونکە بەتەنیشت ئەو دەرمانانەوە، هۆش و خواستی مرۆڤ کز

---

بووە، بەڵکو تۆڵە سەندنەوەیش بووە لە شێخە هەقەکان کە توانیویانە بەشێکی زۆر لە دانیشتووانی گوندەکانی ئاغاکانی پشدەر بکەن بە دەستەودایەرەی خۆیان!)) بڕوانە (ئاوێنەی ژینم، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٨٧.)

دەبێ. دەتوانرێ بەهۆی نوواندنی موگناتیسییەوە یاخود چاوبەستەوە، کار لە ئەوانە بکرێ، هەر کارێکیان پێ بسپێررێ پێیان ڕاپەڕێنرێ. پاشان کە هاتنەوە هۆشی خۆیان، هەر چییەکیان پێوتراوە و پیشان دراوە، لە بیریان دەچێتەوە. ئێمە ئەوەمان بۆ دەرکەوتووە کە هەقەکانی ئێمە لە لایەن شێخەکانیانەوە لە هەموو کۆبوونەوەیەکیاندا ئەوەیان دەرخوارد دەدرێت، بێجگە لە ئەوە وەك چاومان پێ دەکەوێت زۆر لە هەقەکان چاویان هەموو دەم ئەبڵەق و کزە!... زۆریشیان کز و بێهێز و سستن. لە دەنگی بەرز دادەچڵەکێن. ئەمانە هەموویان نیشانەی خواردنی بێهۆشدار یاخود دەرمانانی بێهۆش کردنن.))[1]

ئەم شێوەیە لە بەربەرەکانێکردنی هەقەکان پەیوەندی بە ئەو داخراویی و گۆشەنیگا جیاوازەوە بووە کە هەقەکان بۆ ناسینی خوا و ژیان و دابونەریت، هەیان بووە، کە لە لایەکەوە نەیانهێشتووە ئەوەی بیری لێدەکەنەوە و باوەڕیان پێی هەیە، بگاتە دەرەوەی خۆیان. لە لایەکی تریشەوە، کۆمەڵێك لە ناویاندا ڕێگەی تەسەوف گرتووە و لە دنیابینی تەسەوفەوە نەیارێتی شەریعەتیان کردووە. هەموو ئەمانە، بوونەتە هۆی ئەوەی ئەو قسانەیان شوێن بخرێت و لە لایەنی ئاینییەوە بە لادەر و کەسانێکی خراپ ناوبهێنرێن. تەنانەت لە سەردەمی مامەڕەزادا، مەلاکانی سلێمانی لە کۆبوونەوەیەکدا داوای ئەوەیان کردووە بۆ وازهێنان لە ئەم ڕێباز و ڕێچکەیە، پێویستە مامەڕەزا و یەك دووانێکی تر لە سەرۆکەکانی هەقە بکەن بە داوا.[2] تەنانەت لە سەردەمی حەمەسووریشدا پڕوپاگەندەکە گەیشتووەتە ئەوەی کە گوایە حەمەسوور داوای پێغەمبەرایەتی دەکات و خۆی بە پێغەمبەر دەزانێت، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت ئەم پڕوپاگەندەیە

---

1- کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٣، ژمارە٧، ل١٠١- ١٠٣.

2- بڕوانە (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل١١٣- ١١٤).

لە کێشەیەکی نێوان حاکم موعتەسەم و حەمەسووردا سەری هەڵداوە، هەروەک (حەسەن زێنەب) دەڵێت ((خاڵۆی حاکم موعتەسەم کاتی خۆی لە لامان کاری دەکرد، ئاسیاوێکی هەبوو، ئێمە لێمان کڕی. دوای کۆچی دوایی خاڵۆکەی، وەستا ئەحمەد لە سەر شا محمدی تاپۆ کردبوو، بە سێسەد دینار تاپۆکەی لێسەندین... لێرەوە موئامەرەی ئەوەمان بۆ هەڵبەسترا کە کاکە حەمە ئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەکات و ئائەوەیە کە لە سەر ئێمە بڵاو بووەتەوە.))[1] سەبارەت بە ڕاستی ئەم پروپاگەندەیەش، تەلحەی خێزانی حەمەسوور دەگێڕێتەوە کە ((شەوێکیان حاکم موعتەسەم و پۆلیسێکی گەورە هاتنە تەکیەکە و لەگەڵ کاکە حەمە دانیشتن و بە فێڵ چەند قسەیەکیان لێ پرسی، بەڵام حەمەسوور ئەو کاتانە باسی پێغەمبەرایەتی نەکردبوو، بەڵکو باسی پێغەمبەرایەتی پەیوەندی بە پێشترەوە بووە کە کاتی خۆی و لە سەردەمی شێتەکاندا، شێتێک هاوار دەکات: خوا ڕەحمی نەماوە! چیتر هاواری لێناکەم و هاوار لە پێغەمبەر دەکەم، کاتێک شێتەکە چەند جارێک هاوار دەکات: پێغەمبەر، پێغەمبەر... حەمەسوور لە ئەوبەرەوە هاواردەکات: بەڵێ، بەڵێ... ئیتر لە ئەو کاتەوە ئەم قسەیەی لە سەر بڵاوکراوەتەوە.))[2]

**٢- ڕووبەڕووبوونەوە وەک سیاسەت:**

**((هۆی ڕۆشنگەری و شێوازی هاوکاری نێوان پەیڕەوانی هەقە، وایکردبوو کە ئەم دەستەیە ڕەنگی سیاسی بە خۆوە بگرێت، بەهۆی داواکاری گیانی**

---

١- ئەم وتەیەی، لە ئەو چاوپێکەوتنەدا هاتووە کە لەلایەن کاک (عەباسی ڤیدیۆ)وە لەساڵی ١٩٨٦دا وێنە گیراوە.

٢- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (تەلحە سەید حەمیدی دەلۆیی) ڕۆژی ٢/٩/٢٠٠٩، کەرکوک.

سەربەخۆیی لە لایەن هەقەکانەوە، لە شەڕی بەردەرکی سەرای سلێمانیدا، ئینگلیزەکان هەقەکانیان بە مەترسی بۆ سەر خۆیان زانی.))[1] بۆیە بەشوێن ئەوەبوون تا بزانن هۆی ئەم دژایەتییەیان لە لایەن دەستەی هەقەکانەوە بۆ چ هەستێك دەگەڕێتەوە؟ بەتایبەت دوای ئەوەی کە لە سەدەمی شێخ عەبدولکەریمدا، هەقەکان یارمەتی شۆڕشی شێخ مەحموودیان داوە و ((پێش شەڕی کۆتەڵ، شێخ عەبدولکەریم پەیوەندی بە شێخ مەحموودی نەمرەوە هەبووە و بەڵێنی یارمەتی دانی داوەتێ... ئەوەبوو لە ئەو شەڕەدا ژمارەیەکی زۆر لە خزمانی شێخ عەبدولکەریم لە عەشایەری ناوچەی ئاغجەلەر، بە فەرمانی شێخ و بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدوڵلای برای، لەگەڵ کاکەڕەزای کوڕی کاکە عەلی عەسکەریدا، شاخی گەورەدێیان بۆ پاڵپشتی لەشکری شێخ مەحموودی نەمر و ڕێگرتن لە هێرشی سوپای ئینگلیزەکان، لەو ناوچەیەوە بۆ سەر کۆتەڵ گرت و تا شەڕ کۆتایی نەهات، هەروەك شێخ مەحموود فەرمانی دابوونێ، سەنگەری خۆیان چۆڵ نەکرد.))[2] جا لەبەرئەوەشی کە بیری هەقەکان لە لایەن ئینگلیزەوە جێی گومان و پرسیار بووە و ئەو پڕوپاگەندانەی لە سەر هەقەکانیش زۆرتر گومانەکەیان لەسەر هەقەکان گەورەتر کردبووەوە، بەتایبەتی کاتێ وا باوبووە گوایە هەقەکان مەیلی کۆمۆنیستییان هەیە، کە دەبێت بۆچوونی ئیدمۆنزیش وەك ڕاوێژکارێکی ئەو کاتانەی وەزارەتی ناوخۆ، ڕۆڵی خۆی تێدا هەبووبێت، بۆیە ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٩٢٤دا شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە و چەند کەسێکی تریان دەستبەسەر کرد. ئەم پڕوپاگەندەیەی کە گوایە هەقەکان مەیلی کۆمۆنیستییان هەیە، تا سەردەمی حەمەسووریش هەر لە برەودا بووە، کاتێ ئەم

---

١- تاریخ تصوف در کردستان، سەرچاوەی پێشوو...، ل٣٠٥.

٢- ئاوردانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...ل٤٦.

تاوانـەی دەخەنـە پـاڵ کـە گوایـە ((حەمەسـوور بەڕاشـکاوی ڕایدەگەیـەنێت لـە ڕوسیاوە هاتووە و بەنیازە ڕێبازی شیوعییەت و کۆمۆنیستی لە ئەو وڵاتە بۆ ئێراق بگوازێتەوە و ئێراق داگیربکات و پاشان بەرەو وڵاتانی تـر بڕوات، لـە لایـەن چـەند کەسێکەوە لە کاسێتێکی دەنگداردا ئەم قسانەی تۆماردەکرێت و بـەبێ ئاگاداری حەمەسوور دەیگەیەننە بەغدا.))[1] و لە کاتی دادگاییکردنەکەیدا لە سەر کێشەکەی خاڵۆی حاکم موعتەسەم، ئەم دۆسییەشی لەسەر دەکرێتەوە.[2]

### ٣- ڕووبەڕووبوونەوە وەك کێشەی کۆمەڵایەتی:

لە ئەو کاتانەدا، بارودۆخی کوردستان بەگشتیی و ناوچەکە بەتایبـەتی، لـە زۆر لایەنەوە لـە ئـەو پـەڕی دواکەوتنـدا بـووە. (شـاکیر فـەتاح) لـە کۆمەڵـە ڕۆژنامـەی چەمچەماڵدا و لە ژێر ناوی (خۆشەویستی سەرچاوەی کامەرانییـە) باسـی خراپـی ناوچەی چەمچەماڵ دەکات و دەنووسێت ((لە ئەو ڕۆژەوەی هاتووم بۆ چەمچەماڵ تا ئیمڕۆ[3]، ئەوەنـدەی لـە دەسـتم هاتبێـت ئامۆژگـاری دانیشـتوانی ئـەم ناوچـەیە دەکەم: کە برابن لەگەڵ یەکتردا، ئەمەندە دڵ پیس و قین ئەسـتوور و ڕق پەرسـت و تۆڵەویست مـەبن. بەسیەتی ئەمەنـدە دوژمنایـەتیی و نـاکۆکیی و نـەکوڵی. ئـەم ناوچەیە لە هیچ ناوچەیەکی تر، لە خاك و ئاو و شاخ و سامانی خواپێـداو، کـەمتر نییە. ئەوەی بۆ ئێرە هەڵکەوتووە، شوێنانی تـر خـەوی پێـوە دەبیـنن، کەچـی ناوچەکانی تـر تـادێن ئـاوەدان ئەبنـەوە، دانیشتووەکانیـشیان ڕۆژ بـەڕۆژ گـەش و کامـەران و خـۆش گـوزەران دەبـن. ئێـرەش ڕۆژ بـە ڕۆژ دادەکـەوێ و هـەژارتر و

---

١- کورتە باسێك حەمەسووری گوندی کلاوقوت، سەرچاوەی پێشوو...، ل٥٢.

٢- بڕوانە بەڵگەنامەی چوارەم لە کۆتایی ئەم پەرتووکەدا.

٣- مەبەستی لـە ڕۆژی ١٩٤٦/٤/٢٨ بەدواوەیـە کـەتا ١٩٤٦/٨/١٢ وەك قائمقامی چەمچەماڵ دەست بەکاربووە.

کەساستر دەبێ!... ئاخۆ دەزانیت ئەمە لەبەر چییە؟ ئەمە لەبەر دوو دڵی و چەوتی و خراپیی دانیشتوانی ناوچەکەیە!))[1] کێشەی زەوییوزار بەتایبەتی لە ئەو کاتانەدا، گەورەترین کێشەی کۆمەڵایەتی بووە و جووتیارەکان لە هەوڵی ئەوەدابوون کە لە هەر لایەکەوە بێت پاڵپشتێکیان بۆ پەیدا ببێت. جا لەبەر ئەوەشی کە ((هەقەکان هاتوون تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتییان ئاوێتەی بەرنامەی سۆفیگەری خۆیان کردووە، کەوا رێبازەکانی تری موناقیسیان کەم و زۆر خۆیان لە قەرەی نەداوە و توخنی نەکەوتوون، لەبەر ئەوە پیر و شێخی ئەو رێبازانە تینیان بۆ هاتبوو، ترسیان لێ نیشتبوو، کە ئەگەر تەسەوفی ئەم بەرەیە "هەقە" ببێتە هۆیەک، یان نموونەیەک کە سەرومڕ تەسەوف بەو رێگەیەدا بروات... مورید و مەنسوب و مەحسوبەکانی ئەمانیش واتە: جەماوەرەکەیان... لێیان دەکەونە پرتە و بۆڵە، کە ئەنجامەکەی بە داخوازیی و داواکاری دەشکێتەوە.))[2] لەئەمەش هۆیەک بوو بۆ ئەوەی ژمارەیەک لە جووتیارانی ناوچەکە رووبکەنە ئەو ئازادییەی کە رێبازی هەقە بانگەشەی بۆ کردبوو، بە ئەمەش ئاغاکان نیگەران دەبن و دەکەونە دژایەتی هەقەکان. لە لایەکی دیکەشەوە، ژمارەیەک کێشە لە نێوان هەقەکان و جووتیارەکاندا رووی داوە و جگە لە پێکدادان، سکاڵای یاسایی لە سەر یەکتریی تۆمار کراوە و و قسەوباس و ناوبژیوانیش لە نێوانیاندا کراوە، کە لە ئێرەدا چەند نموونەیەک لە ئەو رووبەڕووبوونەوەیە دەهێنینەوە:

یەکەم: (شاکیر فەتاح) لە کۆمەڵە رۆژنامەی چەمچەماڵدا و لە ژێرناوی (شەڕ و ئاژاوە)دا دەنووسێت ((لە ناوەند دەستەی "شێخ عەبدوڵڵای گۆپ تەپە" و دەستەی "سەید ئەحمەدی خانەقا" دا لە سەر ناوی دێی "عەسکەر" لە مانگی

---

١- کۆمەڵە رۆژنامەی چەمچەماڵ، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٣، ژمارە٢، ل٣٨.

٢- بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٤٢- ٤٣.

پێشوودا[1] شەڕە تفەنگێك و هەراوهوریا و ئاژاوەیەك ڕووی دا. یەكێك لە دەستەی "شێخ عەبدوللا" كوژرا. بەڵام فەرمانڕەوایی زوو فریاكەوت. شەڕەكەی كوژاندەوە و لەشكری " هەقەكانی شێخ عەبدوللای گۆپ تەپە"ی بڵاوە پێكرد. پێنج كەسی لە "هەقەكان" و هەر چوار كوڕەكانی شێخ عەبدوللای خستە بەندیخانەوە و پیاوێكی سەید ئەحمەدی خانەقایشی گرت. "ئاوەكەی عەسكەر"یشی خستەوە دەست سەید ئەحمەدی خانەقا، كە بەفرمانی پارێزگاری كەركوك درابووە دەستی.))[2]



سەید ئەحمەدی خانەقا*

---

١- مەبەست لە مانگی شەشی ساڵی ١٩٤٦ـە، چونكە شاكیر فەتاح ئەم نووسینەی لە ژمارە یەكی ڕۆژنامەی چەمچەماڵدا دەركردووە كە لە ڕۆژی ١٩٤٦/٧/١دا یەكەم ژمارەی لێدەرچووە.

٢- كۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ، سەرچاوەی پێشوو...، ژمارە ١، ل٨- ٩.

*- سەید ئەحمەدی خانەقا (١٨٧٣- ١٩٥٢) كوڕی حوسێن كوڕی عەبدولقادر كوڕی سەید ئەحمەدی سەردار بەرزنجییە. یەكێكە لە ناودارە پایەبەرزەكانی ئەو سەردەمەی شاری كەركوك. لەسەردەمی عوسمانییەكاندا، دەسەڵاتێكی زۆری بووە. هەموو هۆزەكانی ناوچەی كەركوك و هەولێر و سلێمانی، بەگەورەی خۆیانیان داناوە. خوێندنی ئایینی لەكەركوك تەواوكردووە. زۆر زیرەك و زمان پاراو و

دووەم: ((لە کاتی تەسویەی حقەقی زەوییوزاردا، هەندێ لە ئاغاکانی پشدەر و کۆیە ویستبوویان گوندی "گەڵنێری" کە کەوتە ناوچەی "مێرزا ڕۆستەم"ی سەر بە ڕانیە، بۆ خۆیان داگیر بکەن. خەڵکی گوندەکە دەچنە لای مامەڕەزا بۆئەوەی یارمەتیان بدات. ئەو خەڵکە سەنەدێکی فەرمی لای دادنووس بۆ مامەڕەزا دەکەنەوە کەوا زەوییوزارەکانیان هی ئەوە. مامەڕەزایش پشت بە ئەو سەنەدە، ئاغاکان لە دەست بەسەراگرتنی گوندەکە دوور دەخاتەوە و پاشانیش زەوییوزارەکان بۆ خەڵکی دەگەڕێنێتەوە.))[1]

هەر لە سەر کێشەی زەوییوزار، کێشە لە نێوان حەمەسوورییەکان و جووتیارەکانی سەر ئاوی خاسە ڕووی داوە و (د. عەبدولستار تاهیر شەریف) ئەوە دەگێڕێتەوە کە ((لە ساڵی ١٩٦٣دا ناکۆکییەك کەوتە نێوان حەمەسوور و هەندێ لە جووتیارەکانەوە لە سەر بەشێك لە زەوی ڕەزەکەی کەنار ئاوی خاسە. حەمەسوور لە بەیانییەوە تا ئێوارانێکی درەنگ، جووتێ جزمەی دەکردە پێی و لەگەڵ هەندێ لە موریدەکانی خەریکی ئاوی خاسە دەبوون، بەبێڵکاری شیوەکەی ئاوی خاسەیان لە زەوییەکەیان دوور دەخستەوە. دوای چەند ساڵێك، توانی پانتایی زەوی ڕەزەکەی فراوانتر بکاتەوە. چەند جووتیارێکی دێی کلاوقوت شکاتیان لە حەمەسوور کرد گوایە ئەو زەویە زیادەی کە لە ئەنجامی بێڵکارییەکان درووست بووە، کاکە حەمە دەبێت بەشێکی بگەڕێنێتەوە بۆ سەر زەویەکانی ئەوان، کە زەوییەکانیان لە دەم زەوییەکەی ئەو بوو، کەواتە ئەوانیش بێنە پێشەوە و بەشێك لە زەوییەکەی ئەو قوت بدەن. ئەوەبوو لیژنەیەکم

---

قسەخۆش و ئەدەب دۆست بووە. زۆرباش زمانی کوردیی و عەرەبیی و فارسیی و تورکی زانیوە. پاش نەمانی دەوڵەتی عوسمانی، ئینگلیزەکان ویستیان هەندێك کار بگرنە دەست، بەڵام سەید ئەحمەد ڕازی نەبوو. بەتاوانی تورك خواهی، بۆ بەغدا و بەسرە دوورخرایەوە.

١- ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٦٢.

بەسەرۆکایەتی خۆم دانا وەك لێپرسراوی ناوچەکە و برگەکانی یاسای حاویەم بەکارهێنا بۆ چارەسەری کێشەکە... حەمەسوور پێمی وت: شێخ ستار ئەگەر بەحوکمی خوا کێشەکەمان دەبڕێنیتەوە، یان بە قسەی کلاوقوتی، ئەوا پێویست بە ئەم دادگاییکردنە ناکات، خۆ ئەگەر بە قەناعەت و ویژدانی خۆت دادگاییمان دەکەیت، ئەوا من بەبڕیاری تۆ ڕازیم. منیش وتم: کاکەحەمە، من ئەگەر قەناعەتم نەبێت، بەقسەی کەست لەگەڵ ناکەم، ئەوەبوو هەقەکەم دایە حەمەسوور و ئەویش وتی: بژی عەدالەت. پاشان بە حەمەسوورم وت: بۆچی وات وت؟ وتی: شێخ ستار بەچاوی خۆت ئیشەکانی خوا دەبینی... زۆر درێژەی بە قسەکانی دا کە لە ئێرەدا جێگەی بڵاوکردنەوەی نییە.))[1]

هەر لەبواری کێشە کۆمەڵایەتییەکاندا، لەبەر ئەوەی ئافرەت لە کۆمەڵی هەقەدا سەربەستییەکی زۆرتری هەبووە، ئیتر ئەوەی ئەمەی بەلاوە پەسەند نەبووبێت، کەوتووەتە پروپاگەندە هەڵبەستن بۆیان و بە لادەر و داوێن پیس، ناویان بردوون و ((ئافرەت و سەربەستی ئافرەت بوو بەهۆی ئەوەی کە دوژمنەکانی بزووتنەوەی هەقە و مامەڕەزایی، وەك هۆکارێك بۆ ناوزڕاندیان، بەکاری بهێنن. بەبڕوای من ئەمە بە دەستی ئینگلیزیی و حکومەتی پاشایی ئەوکاتە بوو. لە شۆڕشی شێخ مەحموود و شۆڕشەکانی بارزان و شورشی ئەیلول و نوێشدا، هیچ کات ئەمان لە سەنگەری حکومەتدا نەبوون، تەنانەت، یارمەتی کۆماری کوردستانیشیان داوە. ئەمە لە لایەکەوە و لە لایەکی تریشەوە کوێخا و ئاغاکانی ئەو سەردەمان بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ دەسەڵاتدا بوون. بۆ ئەم مەبەستەش، دەسەڵات لە ڕێگەی ئەوانەوە بابەتی ئافرەتی کردبووە چەکێك بۆ دوژمنایەتییان. ئەوەندەی کە من تێکەڵاویان بووبێتم، ئافرەتیان کراوە و بەرێز

---

١- کاکە حەمەی کلاوقوت و هەندێ سەرنج و بیرەوەری، سەرچاوەی پێشوو...، ل٢١- ٢٢.

بووە، پرسیان پێکراوە و قسەیان بەهەند وەرگیراوە، لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا قسەیان هەبووەو لە هەندێ کاتدا قسەیان زیاتر لە پیاوان وەرگیراوە. ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، شتێکی لە ئەم بارەوەم نەبیست و نەدی.))[1] تەنانەت لە ئێستاشدا بەشێك لە ئەم پروپاگەندانە بەبێ ئەوەی ڕاستییەکی تێدابێت، دەوترێنەوە، هەروەك چۆن (بەهجەت محەممەد) دەنووسێت ((حەمەسوور خۆی چوار ژنی هەبوو کە کچی داروەستەکەی خۆی بوون، لە جوانترینی ژنی گوندەکە بوون، کەس و کارەکانیان هەر بە منداڵی بەخشیبوویانە حەمەسوور کە لە تەمەنی باوکەکانیاندا بوون، هەتا کۆچی دوایی کردووە، لەگەڵیدا مانەوە. حەمەسوور پیاوێکی توندوتیژ بوو، وەك منداڵ لە کاتی سەرپێچیکردندا لە پیاوەکانی خۆی دەدا. ڕووی نەدەدا کە کەسێك لێی هەڵبگەڕێتەوە، لە پاش دارکاریی و تێهەڵدان، زەلامەکانی لێی دەپاڕانەوە و دەست و پێیان ماچ دەکرد، بۆ ئەوەی لێیان ببوورێت. گەر کەسێکی سزا بدایە، دەری دەکرد و ژنەکەیشی لێدەسەندەوە و لە کەسێکی تر لە پیاوەکانی مارەی دەکرد. حەمەسوور بە ڕەچەڵەك خەڵکی ئالان و سوەیلە لە کوردستانی ڕوسیا... سەرەتا بەبێ مەلا ژنیان دەهێنا و مارەیان دەکرد...))[2] هەروەك پێشتر وترا، ئەوەشی کە وایکریووە ئەم بۆچوونە هەڵانە لای هەندێ کەس بە ئاسانی جێگەی باوەڕبێت، داخراویی ناو هەقەکان و تێکەڵاو نەبوونیان بووە لەگەڵ کەسانی ناهەقەدا، بۆیە قسەوباسی ناڕەوا ئەگەر هەشبووبێت، زۆرتری پێوەنراوە و بەهەموو لایەکدا بڵاوبووەتەوە. هەر لە ئەم بارەیەوە (جەمال بابان) دەنووسێت ((لە ڕاستیدا منیش ئەو قسەو قسەڵۆکانەم بیستبوو لە سەر هەقەکان، بۆیە بە پەرۆشەوە دەمەویست بچمە ناویانەوە و

---

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٣٠، سلێمانی.

٢- کورتە باسێك حەمەسووری گوندی کلاوقوت، سەرچاوەی پێشوو...، ل٥١ و ٥٢.

لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکەم، بۆ ئەم مەبەستە لە کەسە ناودار و بەناوبانگەکان و زانایانیان نزیک دەبوومەوە، ئەوانیش دەیان وت، ئێمە هیچ کاتێک بەنەخوێنی حەراممان لە کەس نەکردووەتەوە و کەسیش بەنەخوێنی حەرامی لێمان نەکردووەتەوە، تەنانەت ناودارێکیان لە ئەم بارەوە پێی وتم: من لە ئاست غەیری مەحرەمی خۆمدا، پیاوەتیم نامێنێت. هەرچییەکیش لە بارەیانەوە وترابێت ڕاست نییە.))[1] بۆ نموونە ئەوەی ئیدمۆنز لە سەر ژن و پیاوی هەقە نووسیویەتی و لە زمانی کەسێکی ترەوە وەری گرتووە، ڕەنگە هەر ئەو پێکەوەبوونە بێت کە کاتی خۆی لە سەرگەڵو و ((دوای نوێژی خەوتنان ئافرەت و دەستە کچ، کوڕێکی هەڵپەڕکێیان سازدەکرد و بەشێخیاندا هەڵدەوت و بە ئاوازێکەوە دەیان وت: "هیمەی ناکەم هیمەی بەدرۆ"... ئینجا دوای ئەوەی کە ئەم کوڕە تەواو دەبوو، دەستیان هەڵدەگرت و چەند کەسێك لێیان، حاڵ یان جەزبە دەیگرتن.))[2]

یەکێکی تر لە ئەو خەوشانەی کە دراوەتە پاڵ هەقەکان، ئەوەیە کە هەقەکان نەیاری خوێندن و مەکتەب بووبن لە ناوچەکانیاندا، کاتێك (شاکیر فەتاح) دەنووسێت ((ئەمانە بەزیندان کردن و لێدان، چارە ناکرێن. تەنها شتێك کە بیانخاتەوە سەر ڕێی ڕاست ئەوەیە کە شێخ و سەرکردەکانیان لێ دوور بخرێنەوە. ئنجا خوێندنگایان بۆ بکرێتەوە، تێیاندا بخوێنن و فێری کار و پیشەسازی ببن، کارگەشیان بۆ بکرێتەوە تا بەڕەنجی شانی خۆیان، نانی خۆیانی تێدا پەیدا بکەن و بیروباوەڕی زانست و هونەر و پیشەسازی بچێتە مێشکیانەوە، بۆ ئەوەی ئەم مێشکانەیان لە بیروباوەڕی پڕوپووچ پاك بکاتەوە و کردەوەشیان بەوپێیە پێ

---

١- چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (جەمال بابان) ڕۆژی ٢٠٠٩/١/٥، سلێمانی.

٢- بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل٤٨- ٤٩.

بگۆڕێ و بەرەو پێشکەوتنیان ببات. جا خۆزگە ئەم ئاواتەمان دەهاتە دی.))[1] هەر بۆیە ئەو ماوەیەی کە لە ئەوێ وەك فەرمانبەر و دەسەلاتدارێکی میری دەستبەکاربووە ئەم ڕێگەچارەیەی جێبەجێ کردووە و دەنووسێت ((لە پاش چەندوچوونێکی زۆر، توانیم خوێندنگایەکیان بۆ بسێنم و لە دیوەخانی شێخەکەیاندا بۆ منداڵەکانیان بکەمەوە، بەڵام تاوەکو هەقەکانم هێنایە سەر ڕێ کە بخوێنن و تا شێخەکانیانم بۆ دەمکوت کرا کە واز لە تێکدانی خوێندنگاکە بهێنن، زۆر ماندو بووم! ناچار بووم ڕێ نەدەم بە شێخەکانیان بێنەوە جێی خۆیان، لە ترسی ئاژاوەنانەوە و تێکدانی ئەو خوێندنگایە و تەمەڵ کردن و هەژارکردنی ئەو هەقە بەسەزمانانە.))[2] بەڵام ئەم قسەیە بۆ تەواوی مێژووی هەقەکان ڕاست نییە، چونکە هەر لە سەرەتاوە ژمارەیەکی لەبەرچاو لە بنەماڵە دیارەکانی هەقەکان نراونەتە بەر خوێندن و کەسانی خوێنەوار بوون، وەك چۆن لە ((سەرگەڵو لە ساڵانی ١٩٢٥–١٩٣٦دا... گەلێك لە کوڕە شێخەکانی سەر بە "هەقە" لەگەڵ خۆمدا قوتابی بوون، وەکو "شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شێخ عەبدولکەریم"ی شەدەڵە و خوالێخۆشبوو" شێخ مستەفای کوڕی مامەڕەزا"... هەروەها "عەبدولقادری کوڕی شێخ عەبدوڵلای عەسکەر" و "سەید ئەحمەد"ی برای کە پێمان دەوت "سەیدە"... "مامە قالە"ی کوڕی "حاجی شێخ عارف"یش... ژمارەی قوتابیانی ئەوسای سەرگەڵو دەگەیشتە ٣٠–٤٠ قوتابی.))[3] کەواتە ئەو قسەیەی (شاکیر فەتاح) بۆ هەموو مێژووی هەقەکان ڕاست نییە.

---

١– کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٢، ژمارە٧، ل١٠١– ١٠٣.

٢– ئاوێنەی ژینم، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٨٨.

٣– بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە، سەرچاوەی پێشوو...، ل١٦– ١٧.

## بەڵگەنامەی یەکەم:

## دەقی نامەیەکی (مەولانا خالید) بۆ (شێخ ئەحمەدی سەردار)



## بەڵگەنامەی دووەم:

## دەقی نامەیەکی (شێخ ئەحمەدی سەردار) بۆ (مەولانا خالید)*.



*– ئەم نامەیە لە وەڵامی نامەکەی مەولانا خالیددا، نووسراوە.

## بەڵگەنامەی سێیەم:

## ناسنامەی باری شارستانیی حەمەسوور



الدولة العراقية

مديرية النفوس العامة

للذكور

الرقم ٠٠٦١٥٦ اللواء: كركوك

صاحب الدفتر رقم ٠٠٦١٥٦

الاسم واللقب

اسم الاب

اسم الام

پووی دەرەوەی ناسنامەی باری شارستانیی (حەمەسووری کڵاوقوت)*



عنوان القيد

الأوصاف الجسمية والشخصية

رقم الدفتر ٠٠٦١٥٦

محل الولادة

تاريخ الولادة

سند التاريخ المذكور

ڕووی ناوەوەی ناسنامەی باری شارستانیی (حەمەسووری کڵاوقوت)

*– ئەم بەڵگەنامەیە لە ئەرشیفی (بەختیار حەسەن کەریم)ی کچەزای حەمەسوورەوە، پێشکەش بە لێکۆڵەر کراوە.

## بەڵگەنامەی چوارەم:

## دادگاییکردنی حەمەسوور

لە ڕۆژنامەی (الجمهوریە)ی ڕۆژی پێنجشەممەی مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٨دا، لە ژێر ناونیشانەکانی (یاریدەدەرێك لە هێزی سەیار، ڕێبازی حەمەسوور، بە کردەوەی خراپ ناودەبات) و (یەکێك لە شایەتەکان، "حەمەسوور" بەوە تاوانبار دەکات کە لە بنچینەدا ڕوسییە و لە ئێرانەوە هاتووە)دا، (سەجاد ئەلغازی) بەم شێوەیە دەنووسێت:

ئەنجومەنی عورفی سەربازی، بە سەرۆکایەتی عەقید (شەمسەدین عەبدوڵلا) و بە ئەندامێتی هەریەك لە موقەدەم (عەبدولڕەزاق جەددە) و موقەدەم (نافیع ئەحمەد) دانیشت. لە ئەم دانیشتنەدا، هەریەك لە مولازم (ڕاغیب فەخری) وەك داواکاری گشتیی سەربازیی و یاریدەدەر (یوسف سەراج) وەك نوێنەری پۆلیس و (محەممەد ئەحمەد حافیز) وەك پارێزەری تۆمەتباران، ئامادەبوون.

دانیشتنەکە تایبەت بوو بە کێشەی (حەمەسوور) کە بە (بانگەشەکردنی پێغەمبەرایەتیی و بڵاوکردنەوەی خراپەکاری) تۆمەتبار کراوە. ئەنجومەن گوێبیستی وتەی دوو شایەتی تر بوو کە لە سەر هەندێ لایەنی تر و خراپەکاریی تری ڕێبازی خراپەکارانەی تۆمەتبار (حەمەسوور) و بانگەشەکەیەوە، شایەتییان دا.

## شایەتی یەکەم:

### یاریدەدەر (عەبدئەلمونعیم محەممەد)

### یاریدەدەر لە هێزی سەیار لە بەغداد:

لە مانگی شوبباتی پێشوودا، زانیاریمان لە سەر کەسێك بە ناوی (حەمەسوور)ەوە پێگەیشت کە دانیشتوی گوندی کلاوقوتە. بۆ ئەم مەبەستە، لە کەرکووك لەگەڵ خەڵکیدا دەستمان بە لێکۆڵینەوە کرد. یەکێك لە ئەوانە، بەڕێز (موعتەسەم) بوو کە زانیاری باشی لە سەری هەبوو، لەبەر ئەوەش کە زمانی کوردی دەزانی، داوام لێ کرد کە بچین و لە کلاوقوت چاومان بە (حەمەسوور) بکەوێت. ئەوەبوو ڕۆژێکیان چوومە ماڵی موعتەسم و لە ئەوێ سێ کەسم بینی، بەیەکەوە و بەڕێبەری یەکێك لە شوێنکەوتوانی (حەمەسوور) چووینە گوندی کلاوقوت و سەرمان لە ماڵی (حەمەسوور) دا. لە ئەو کاتانەدا (حەمەسوور) لە ئەوێ نەبوو، پاش ماوەیەك ئینجا هاتەوە و منیش وەك نەناسێك و لە ڕێگەی وەرگێڕێکەوە- موعتەسەم - کەوتمە پرسیار لێکردنیی و ئەمانەم بۆ دەرکەوت:

١- (حەمەسوور) دان بە بوونی خوادا نانێت و پێی وایە دنیا لە کۆنەوە بووە و هێزێك نییە کە ئەم دنیایە بسوڕێنێت.

٢- پێی وایە شێخ عەبدولکەریم وەك خوا وایە و دامەزرێنەری یەکەمی ئەم ڕێبازەیە.

٣- خۆی بە کەسێکی تێگەیشتوو دادەنێت لە سەر ئەم زەوییەدا و پێی وایە کە ڕۆژێك دێت کۆنترۆڵی هەموو بوونەوەرەکان دەکات.

٤- هەر کەسێك کە بێتە ناو ئەم ڕێبازەوە، پێویستە لە سەری کە دەست لە موڵك و خێزانی خۆی هەڵگرێت. (حەمەسوور) خۆی دارایی بەپێی پێویست بەسەر شوێنکەوتوانیدا، دابەش دەکات.

٥- خەڵکی دابەشی دوو بەش دەکات: یەکەمیان: ئەوانەن کە خراپن و خیانەت لە کۆمەڵەکەیان دەکەن، ئەمانە، دوای ئەوەی کۆچی دوایی دەکەن، گیانیان دەچێتە ناو لاشەی ئاژەڵی خراپەوە، وەك: سەگ، بەراز. دووەمیان: وەك کۆمەڵەکەی ئەون، ئەمانە کەسانی باشن و خیانەت لە کۆمەڵەکەیان ناکەن. گیانی ئەمان، دوای کۆچی دوایی، دەچێتە ناو لاشەی کەسانی باشی وەك خۆیانەوە.

٦- شیعرێکی لەبەری بۆ خوێندینەوە، کە بە وشەی کوردیی و فارسی هۆنیبونیيەوە. لە ئەم شیعرەدا هەندێك ئایەتی قورئانی بە ناتەواوی تێدا بەکار هاتبوو.[١]

٧- ئەوەندەی کە لە ماڵەکەیدا ماینەوە، لە بەردەم دەرگاکەدا، چەند ژنێکمان بینی کە دانیشتبوون و دەست و دەموچاویان دەرخستبوو، تا هەستی گەنجانی ئەوێ و لایەنگرەکانیان ببزوێنن.

دوای کۆتایی هێنان بەم قسەوباسانە و هێنانەوەی پەندی مشك و پشیلە، داوام لێ کرد کە پەیوەندی بە ڕێبازەکەیانەوە بکەم، ئەویش پێش هەر شتێك بە ئەوە وەڵامی دامەوە کە دەبێت دەست لە سەیارە و هەر شتێکی تر هەڵگرم کە هەمە و خۆم لە هەموو بەهاکان دابڕم و دوای ماوەیەك ئینجا دەتوانم لە کۆمەڵەکەیدا وەك ئەندام وەربگیرێم. دواتر داوای لێ کردم کە لە ژوورێکدا پێکەوە خەڵوە بکەین...[٢] پاشان بۆ کەرکووك گەڕاینەوە و ئەم خاڵانەمان پێشکەشی لایەنی پەیوەندیدار کرد.

لە کۆتایی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٥٨دا پارێزگار داوای گرتنەبەری ڕێوشوێنی لە دژی (حەمەسوور) و شوێنکەوتوانی کرد تا لێکۆڵینەوە لە ناسنامەکەی بکرێت.

---

١- بڕوانە بەڵگەنامەی پێنجەم لە کۆتایی ئەم پەرتووکەدا.

٢- بە ئەندازەی دوو دێڕ نووسین لە ڕۆژنامەکەدا نەتوانرا بخوێنرێتەوە، بۆیە وەرنەگێردرا.

هەر لە ئەو ڕۆژەدا، (حەمەسوور) و یەکێك کە لەگەڵیدا بوو، لە ناو بازاڕی کەرکووك دەستگیرکران و هێنرانە دائیرە. دوای پشکنینیان، دەست بەسەر کاغەزێکی دەستنووسدا گیرا کە بە زمانی کوردی لە سەری نووسرابوو. دوای وەرگێڕانی نووسینەکە، دەرکەوت کە بەڵێننامەی چەند کەسێك لە شوێنکەوتوانی (حەمەسوور)ە و بە شایەتی چەند کەسێك بەڵێن دەدەن کە ئامادەن دەست لە هەموو موڵك وماڵیان هەڵبگرن و ژنەکانیشیان بە تەلاقدراو دابنرێت، ئەگەر پاشەکشێ لە ئایینی (حەمەسوور) بکەن. کاتێکیش پرسیاری ئەوەی لێ کرا کە ئاخۆ ئەم کارەی بۆچی کردووە؟ بە ئەوە وەڵامی دایەوە کە هەندێك لە شوێنکەوتوانی ڕایان کردووە، لەبەر ئەوە دەبێت هەموو شوێنکەوتووەکانی ئیمزا لە سەر ئەوە بکەن.

دوای ئەمە، بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕەگەزنامەکەی، نێردرایە سلێمانیی و دوای گەڕانەوەشی لە دێی کلاوقوت، ماڵەکەیم پشکنی، بەلام هیچ شتێکم نەدۆزییەوە کە پەیوەندی بە ئەم باسەوە هەبێت. هەر لە کاتی پشکنینەکەدا ئەوەم بینی کە لە بتڵێکدا بۆنی مەی دەهات و لە ئەم بارەیەوە کەسێکی دانیشتووی ماڵەکە وتی (...)[1]

هەندێك لە ئەوانەی کە لەسەر (حەمەسوور) دەستگیرکرابوون، داوایان کرد کە شایەتی لە دژی (حەمەسوور) بدەن؟ چونکە لە پێشدا لێی ترساون و نەیان وێراوە کارێکی لە ئەم شێوەیە بکەن. دوای تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکە، دۆسیێکە بەپێی تایبەتمەندێتی دادگا، نێردرایە لای حاکمی سزای کەرکووك و پاشان ڕەوانەی دادگای گەورە کرا. بەڕێوەبەری ناحیەی سووورداشیش لە سەر ئەمە، زانیاری دامێ و هاوپێچی دۆسیەکە کرا، کە ئەمەش پشتڕاسکەرەوەی قسەکانمن. دوای

---

١- بە ئەندازەی دوو دێڕ نووسین لە ڕۆژنامەکەدا نەتوانرا بخوێنرێتەوە، بۆیە وەرنەگێڕدرا.

ڕۆیشتنمان بۆ گوندەکە لەگەڵ حاکم موعتەسەمدا، زۆر ژنمان بینی، بەڵام منداڵمان نەبینی؟ دواتر زانیمان کە ڕێبازی (حەمەسوور) ڕێگەنادات بە ئەوەی منداڵیان ببێت و تەنها بە چێژی سێکسی دەوەستنەوە.

شایەتەکە لە کاتی شایەتی دانەکەیدا، ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو. ئەم دەنگوباسانە، وەك پروپاگەندە- نەك وەك شتێکی نووسراو- بەشاردا بڵاوبووبووەوە.

من موعتەسەمم وەك هاوڕێیەك- بە ئەو پێیەی کە حاکمی سزای شارەوانی کەرکووك بوو- ناسیوە، خاڵیشی هەر لە شوێنکەوتوانی (حەمەسوور) بوو. (حەمەسوور)م نەبینیوە کە پەیوەندی بە خەڵکەوە بکات، کە چووشینە ماڵی (حەمەسوور)، تێبینی ئەوەمان کرد کە (حەمەسوور) حاکم موعتەسەم ...ناسێت.

من بەشێوەیەکی نافەرمی داوام لە موعتەسەم کرد، ئەویش تەنها لە ئەوە ئاگاداری کردمەوە کە ئەمانە خەڵکانێکن کە کردەوەی خراپ دەکەن.

پ/ تۆ زمانی کوردی نازانیت، پێت وایە کە ئەو وەرگێڕانەی بۆت کراوە، ڕاستە؟ چۆن بۆ ئاسایشت نارد؟

و/ ڕاستە ڕەنگە وەرگێڕانەکە ڕاست نەبێت، بەڵام کەسم دەست نەکەوت کە کاری وەرگێڕانم بۆ بکات.

چارەکە سەعاتێك دوای نانی ئێوارە، جگە لە ماڵی (حەسەن مەحموود، عومەر شێخ مەعرووف و کوێخا مەحموود) کە گوندەکەیان سەر بە ناحیەی شووان بوو، پەیوەندیمان بە کەسی ترەوە لە خەڵکان و فەرمانبەر و بەڕێوەبەری ناحیەوە نەکرد... ئەوەم بۆ دەرنەکەوت کە لە ڕێبازەکەدا شووکردن و ژن هێنان نەبێت، (حەمەسوور)یش دیاربوو کە نەخوێندەوارە و نازانێت بخوێنێتەوە و بنووسێت.

پ/ مەبەستی لە (خەڵوە) چی بوو؟

و/ تۆمەتبار بە بابەتێکی سێکسی ناوی برد. موعتەسەم لە سەر ناوەڕۆکی ڕاپۆرتی سەر تۆمەتبارەکان، هیچ نازانێت.

پ/ چۆنت زانی کە تۆمەتبارەکانی تر، لە شوێنکەوتوانی تۆمەتبارن.

و/ دوای وەرگرتنی وتەی تۆمەتبار، خۆی ئەوەی ئاشکرا کرد کە تۆمەتبارەکان لە شوێنکەوتوانی ئەون.

پ/ دوای گرتنی تۆمەتبار، بۆ لای ئەو کەسانە گەڕایتەوە؟

و/ نەخێر، بەڵام داوام کردن و هەواڵمان پێ دەگەیشت.

پ/ داواکاری گشتی: شایەت چۆن تەفسیری خەڵوە دەکات لەکاتێکدا کە کوردی نازانێت؟ هەر دەبێت وەرگێڕی هەبێت تا لەسەر بیروباوەڕی حەمەسووریی، بگات؟

و/ پشتم بە گێڕانەوەی موعتەسەم بەستبوو. لە کاتی لێکۆڵینەوەدا دەرکەوتبوو کە (حەمەسوور) لە یەکێك لە گوندەکانی سلێمانیدا لە دایك بووە، بە فەرمی بە ئێراقی دانرابوو، کە لە دایکبووی گوندی ڕاوتی سەر بە ناحیەی سوورداشە، لە لای شێخ عەبدولکەریم خزمەتکار بووە، هیچ پارە و مووچەیەکی نەدراوەتێ و دواتر چووەتە گوندی کلاوقوت. تۆمەتبار شیعرێکی خوێندەوە کە هەندێ ئایەتی قورئانی بە ناتەواوی تێدابوو. من ئەو ئایەتانەم دەزانی کە لە شیعرەکەدا هاتبوون و موعتەسەمیش نەیدەتوانی شیعرەکە وەربگێڕێت.

پ/ ئایا بۆت دەرکەوت کە ئەوانەی ئیمزایان لە سەر وەرەقەکە کردبوو، دەستیان لە موڵك وماڵی خۆیان هەڵگرتووە؟

و/ بەڵێ، دانیان بەوەدا نابوو کە لە شوێنکەوتووانی ئەون.

## شایەتی دووەم:

### (موعتەسەم محەممەد خەلیفە) تەمەن ٣٤ ساڵ، دادوەری سزای شارەوانی کەرکووك:

یاریدەدەر (عەبدئەلمونعیم) دەناسم و ماوەی سێ ساڵە هاوڕێمە.

پ/ ئایا پێشتر ئەوەت دەزانی کە یاریدەدەر زانیاری لە سەر (حەمەسوور) و ڕێبازەکەی هەیە؟

و/ بەڵێ، بەر لە نۆ مانگ پێش ئێستا، کاتێك لەگەڵ سەرۆکی یەکەمی خانەنشینکراو (خەیروڵڵا عەتا)ی ئەفسەری هەواڵگریی فیرقەی سێ لە کەرکوك دانیشتبووم، وتی: هەواڵگری سەربازیی زانیاری لە بارەی حەمەسوورەوە هەیە و چۆن پۆلیس هیچ لە بارەیانەوە نازانێت؟! بەڕێوەبەری پۆلیس (عەبدولڕەزاق غەفوور) تازە بۆ لیواکە (لیوای سلێمانی) هاتبوو، منیش سەردانی ئەو و جێگرەکەی (عەبدولمونعیم)م کرد. گۆڤارێکی سێکسیم لەلا بینیی و بە جێگرەکەی (عەبدولمونعیم)م وت: لە سوپادا هەواڵگری فەرمی لە سەر (حەمەسوور) هەیە، ئایا هیچ زانیاریتان هەیە؟ ئەویش پێی وتم کە پەیوەندی بەلایەنی فەرمییەوە دەکات هەتا لە ڕاستی هەواڵەکە ئاگاداربێتەوە. ئیتر نازانم چۆن عەبدولمونعیم شوێن بابەتەکە کەوتووە، چۆن لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە و چۆن (حەمەسوور) دەستگیرکراوە! (حەمەسوور) وای ڕاگەیاندبوو کە موعتەسەم بەهۆی کێشەی ئاشەکەوە شکاتکەرەکانی هانداوە کە شایەتی لەسەر بدەن. کێشەی ئاشەکە پەیوەندی بە شەریکایەتی چەند کەسێکەوە هەبوو، کە یەکێك لە ئەو شەریکانە، بریتیی بوو لە خاڵم کە ناوی (ئەحمەد عوسمان) بوو و یەکێکیش بوو لە شوێنکەوتوانی (حەمەسوور) خۆی. دوای کۆچی دوایی خاڵم، میراتگرەکانی کە بریتی بوون لە دوو کوڕ و دوو کچ، داوایان لە (حەمەسوور) کرد کە بەشەکەیان

بەرن، لەسەر ئەمە، پەیوەندی لە نێوان ئەوان و (حەمەسوور)دا کۆتایی پێهات؟
چونکە حەمەسوورییەکان دەیان وت: ئێمە ئاشەکەمان بە ٦٠٠ دینار لە باوکیان کڕیوە. ڕۆژێکیان (محەممەد مەلا عوبێد) هاتە لام و داوای لێ کردم کە پەیوەندی لە نێوان ئەوان و منداڵەکانی خاڵم دروست بکەمەوە، منیش وتم: باشە، ڕێککەوتن ئاسانە، بەڵام من برایەکی لە خۆم گەورەترم هەیە بە ناوی موقەدەم (عەبدولقادر محەممەد خەلیفە)وە، بابچینە لای ئەو، وتی: باشە. چووینە لای کاکم و لە ئەوێ محەممەد وتی: ئێمە نزیکەی ٣٠٠ دینارمان وەك نۆژەنکردنەوە لە ئەو ئاشەدا خەرج کردووە و دەبێت بۆمان بگێڕنەوە. کاکیشم وتی: باشە، باسەکە دەبەینە لای سێ کەسی شارەزا، تا ئەوان بڕی ئەو پارەیەمان بۆ بخەملێنن. هەردوو لا لەسەر ئەمە پێکهاتن و ئیتر من ئاگام لە هیچ نەما تا ڕۆژێك تۆمەتبار (محەممەد مەلا عوبێد) هاتەوە لام و پێی وتم: منداڵەکانی خاڵت نایانەوێ ڕێك بکەون، منیش بۆ خۆیانم بەجێ هێشت و دوای ماوەیەکی تر، لە ماڵی خۆماندا و بەئامادەبوونی (ڕەشید عەلی) کوڕە خاڵی باوکم و (محەممەد مەلاعوبێد) و کوڕە خاڵەکەم... محەممەد داوای کرد کە ئەو پارەیەی بۆ ئاشەکەی خەرج کردووە، بۆی بگێڕنەوە. منیش وتم: لەبەر ئەوەی کە خاڵم سەر بەخۆتان بووە، بەشکو یارمەتی منداڵەکانی بدەن و ئەو پارەیەی بۆ کەم بکەنەوە. هەردوولا لە سەر ئەوە ڕێککەوتن کە بڕی ١٥٠ دینار بە (حەمەسوور) بدرێت تا ئەویش دەستبەرداری ئاشەکە بێت بۆیان. عوسمانیش وتی: ماوەیەکمان بدەرێ تا ئەو بڕەت بۆ پەیدا بکەین، ئەویش وتی: باشە، بەڵام ئاشەکە لە ژێر دەسەڵاتی ئێمەدا دەمێنێتەوە تا پارەکە ئامادە دەکرێت. پاش ماوەیەك پارەکە لەبەردەم نووسەری دادی کەرکووکدا ئامادەکرا... لە ئەمەنە زۆرتر کە بۆم گێڕانەوە، بەشداریم لە باسەکەدا نەکرد و هەموو ئەو بەڵگانەشم خستووەتە بەردەستی بەڕێزتان کە پشتگیری قسەکانم دەکەن.

پ/ ئەوەندەی تێگەیشتبێتم و گوێم لێت بوو، تۆ لە سەرۆك (عەتا)وە زانیاریت لەسەر (حەمەسوور) داوەتە یاریدەدەر؟

و/ من پارێزەری باوکە کوژراوەکە بووم کە لە شوێنکەوتووانی (حەمەسوور) بوو، ئەو هیچی دەربارەی ڕێبازی هەقە باس نەدەکرد. سەبارت بە هەر شتێك کە لە تایبەتمەندی ڕێبازەکە بێت، هیچی نەدەخستە ڕوو. من سێ جار سەردانیم کردووە و لە یەکێك لە ئەو سەردانانەم شەوێك بوو کە (خەلیل، عومەر خەیات، عەلی مەلا مەجید)م لەگەڵ بوون کە خەڵکی ناوچەکەم و عەشیرەتەکەم بوون. لە سەر ئەوان هیچ زانیارییەکم نییە کە ئاخۆ زانیارییان لە سەر ڕێبازەکە هەبوو یان نا، لە ئەو کاتانەی کە سەردانی ماڵی تۆمەتبارمان کرد، ئەو لە ماڵەوە نەبوو، بەڵام لە ئەوێ چەند کەسێکمان بینی کە نەمدەناسین و پاش ماوەیەك (حەمەسوور) و چەند پیاوێکی گوندەکە دەرکەوتن. دوای دانیشتن و چا خواردنەوە، یاریدەدەری ئاسایش، لە ڕێگەی منەوە، چەند پرسیارێکی ئاراستەی (حەمەسوور) کرد و داوای لێ کرد کە بچێتە ناو ئاوێنەکەیەوە، (حەمەسوور)یش بە ئەوە وەڵامی دایەوە کە تۆ ناتوانیت ئەمە بکەیت و نموونەی پشیلە و مشکی هێنایەوە و داوای لێ کرد کە دەست لە سەیارەکەی هەڵگرێت و لە گەڵیدا بچێتە (خەڵوە)وە، کە مانای خەڵوەی نەدەزانی. سیازدە ڕۆژیش لە ئەوەوبەر، (فەتحییە عەزیز)ی ژنە خاڵم هاتە سەردانمان و لێم پرسی: بۆچی خاڵم تەڵاقی دایت؟ وتی: هۆیەکەی دوور و درێژە و تۆش چاکم دەناسی کە ئێمە کارێك ناکەین کە پێچەوانەی ئایین بێت، خاڵت داوای لێ کردم کە لەگەڵ ژنەکانی تردا کە لە کۆمەڵی (حەمەسوور) بوون ئاڵوگۆڕم پێ بکات، منیش بە ئەوە ڕازی نەبووم و داوای تەڵاقم لێ کرد. خاڵم ژنێکی تری هەبوو بەناوی (فاتمە مستەفا)وە و ئەویشی تەڵاق دا و هەمان باسی لێ گێڕایەوە. خاڵم بەر لە ئەوەی نوقمی ئەم ڕێبازە بێت،

پیاوێکی لە خواترس بوو، بەڵام دوای ئەوەی کە باوەڕی بەم ئایینە هێنا، وازی لە نوێژ و ڕۆژوو هێنا و ئایینەکەی بەدرۆ دەخستەوە. خاڵە ئەحمەدم حەوت ساڵ لەمەوبەر کۆچی دوایی کردووە. خاڵم دەیوت: باوکم بێ بڕوا بوو، پێی دەوتین: ئەگەر قورئانەکەم لێ نەکرن، ئەوا دەیکەم بە تەپڵەکی جگەرە، هەروەها گوێم لە کچی خاڵم بووە کە ئافرەتێکی لە خواترس بووە، دەیوت: کاتێک نوێژم دەکرد، پێی وابوو کە ماڵەکەیم پیس کردووە. کاتێ لەگەڵ (عەبدئەلمونعیم) سەردانی لای (حەمەسوور)مان کرد، (عەبدوللا عەبدولمەجید) پرسیاری ئەوەی لێ کرد کەوا کاتی نوێژکردنی ئێوارە و خەوتن ڕۆیشت، کەچی نە خۆت و نە کۆمەڵەکەت نوێژتان نەکرد؟! (حەمەسوور)یش وتی: نوێژ و ڕۆژوو لە سەر ئێمە هەڵگیراوە. هەموو خەڵکی کەرکوک ئەوە دەزانن کە (حەمەسوور) باوەڕی بە ئایینی ئیسلام نەهێناوە، خاڵیشم لە سەر ئەم ڕێبازە دیاری کراوە، قسەی بۆ نەکردوین.

پ/ بۆچی ماوەی ١٥ ساڵە شکاتت لێ نەکردووە؟

و/ ساڵی ١٩٤١ شکاتم لێ کرد، بەڵام خەڵك هاتە نێوانمانەوە و بابەتەکە داخرا.

پ/ شوێنی ئەم ڕێبازە کوێیە؟

و/ سلێمانیی و دەلو و کلاوقوت.

پ/ ئایا (حەمەسوور) بۆ ئەوەی کە ئەم ڕێبازە بڵاوبکاتەوە، دەگەڕا؟

و/ خۆم نەمبینیوە.

پ/ خاڵت کەی کۆچی دوایی کرد؟

و/ پێش ساڵێك.

پ/ ئایا (حەمەسوور) هەوڵی نەدا کاریگەری لە سەر منداڵەکانی خاڵت هەبێت؟

و/ بەڵێ دەیەویست کە کاریگەرییان لە سەر دروست بکات، بەڵام دوای ئەوەی کە گەورە بوون، ڕایان کرد.

پ/ لە کوێوە هاتووە.

و/ لە شێخ (حەسەنی خانەقا) لە ئێرانەوە، لای شێخ (عەبدولکەریم) کاری کردووە و دوای کۆچی دوایی شێخیش، شوێنکەوتوانی شێخ دابەشی سێ بەش بوون، یەکێك لە ئەو بەشانە، کۆمەڵی (حەمەسوور) بووە. لە نێوان من و تۆمەتباردا ناکۆکی هەیە، پێشتریش هەڕەشەی ئەوەی لێ کردبووم کە بۆمب فڕێدەداتە ماڵەکەمانەوە.

پ/ ئایا هیچ بەڵگەیەکت لایە کە ئەوە بسەلمێنێت کە خاڵت دەستی لە هەموو سامان و موڵکی خۆی هەڵگرتبێت؟

و/ نەخێر، تەنها بەڵگەی فرۆشتنی ئاشەکە لەبەردەستدایە.

پ/ ئایا شایەت لە ئاشەکەدا بەشی هەیە؟

و/ بەڵێ.

شایەت ئەوەشی وت: جارێکیان (حەمەسوور) لە سەر بنچینەی نەزانراوی خۆی قسەی کردووە و وتویەتی: لە ڕوسیاوە بۆ ئێران هاتووە.

سەرۆکی ئەنجومەنی عورفیی سەربازی دانیشتنەکەی بۆ ڕۆژی چوار شەممەی داهاتوو بۆ گوێگرتن لە شایەت و بەرگرییکردن و قسەی بریکاری تۆمەتبار، دواخست.

## بەڵگەنامەی پێنجەم:

## هەقیقەتنامەکەی حەمەسووری کلاوقوت

بیسم اللەالرحمن الرحیم

بخوێنن مەتڵەبی... کەریم

دەلیلی هەق شوناسی، هەروەکو ماسی

کەوتنە بەحری غەواسی

هەموو مەست و فەنا ق اللە بوون

مەستی نەزەری خاتەمول ئەولیا بوون

واسیتە حوکمی مەتین بوو...

لە خەتی شەریعەت و تەریقەت تەوەلا بوون

هەموو ئەهلی زیکر بوون خالید بوون لە زیکر

بوون بە ئەهلی فیکر، فیکریان کرد لە عیلمی ڕەحمانی

وتیان: ئەوە چ حوکم و مەتڵەبێ، ئێمەی هانی

...............................انی

لە ئیمتیحانی بەحری مەعانی

... لە سەر دەستوورێکی شەیتانی

ئیشێکی عەجایب و نادر بوو

خوا بۆ خۆی حوکمی عادل بوو

ئیرادەی لە سەر سابت بوو

ئارەزووی ئیجتیهادیان کرد

یەعنی ڕێگەی سەربەخۆ

لە ئارەزووی ئیجتیهاددا فیرقە فیرقە وەستانەوە

فیرقەیەکیان کرد بە... یەکیان کرد بە تەکبیر
خنکان و بوون بە ئەهلی موتەحەییر
هیچیان نەزانی هەردووکیان
واللە علی کل شیء القدیر
... فەقیر
فیرقەیەك لەوان بوونە مونکیر
وتمان بەڵێ لە واقیعدا واللە علی کل شیء القدیر
ئەمما ئینسان چەند شەرائیتێکی بۆ خواناسی
دەکاتە تەکبیر و زنجیر
ئەو لە میسال شەریعەت و تەکبیر
لە سەر ئەو شەرائیتانە، لیس للأنسان الا ما سعی
... شەهری قەدیر
عیلمی هەقیقەتمان خوێند، چی دەبێتە قسە و کەلیمە
مەلیکی ئێمە کێیە؟ کەریمە
ئەمە قسەیەکی کوردییە، کورت و موختەسەرە
دەلیلی هەق شوناسیمان برادەرە
ئەمە قسەیەکی ئیسبات و بێ شکە
ڕەفیقی قیامەتمان خوشکە
شەیتانمان عەدووە، دینمان دینارە
بۆچی؟ چونکە ئەوەڵ ئاخیر زەمانە
مانای ئاخیر زەمان... شەیتانە
با تێبگات هەر کەسێ مەددی ڕەحمانە
بۆ ئێمە نەزەری کەریم سوپەرە
با لە سەر بەحری هەق شوناسی

بیکەینە موجادەلە و موزاکەرە

با بزانین مانای شێتی چییە؟

ئێمە شێتی تەریقەتین

مانای شێتی، هەقیقەتە

مانای هەقیقەت، خوێندنە

مانای خوێندن سەعییکردنە

مانای سەعییکردن، ئەقڵ و کەماڵە

مانای ئەقڵ و کەماڵ، تەرتیباتە

چونکە تەرتیبات بۆ هەقشوناسی ئیسباتە

کەسێ لە سەر ئەم شەرائیتانە ئیکمالە

... ئیهمالە

ئەو کەسە بۆ کوللی کەسێ، مەنبەعی سوالە

ئەو کەسە موجتەهیدی بەینی حەرام و حەلالە

ئەو کەسە لە سەر نەفسی زاڵم و زەوالە

ئەو کەسە نەزانێکی شەیتانی دەجالە

ئەو کەسە لە نەزەر دنیادا فەقیر و توففالە

ئەو کەسە سەرچەشمەی مەعالیم و کەماڵە

پەنام بە تۆ یا ڕەبی ئەی ئەو کەسەی کە عالم زانی حاڵە

... زۆرپییەتی ئادەم و حەوا... شەیتانە

بۆچی شەیتانە؟ تەوقی لەعنەت لە گەردنیانە

ئەم قسەیە ماعەدای موئمینانە

تەوقی لەعنەت چییە؟ نەفسە

نەفس چییە؟ تەکەبوری دنیایە

بە نەزەری ئەو کەسەی کە خاتەمول ئەولیایە

ئیشتیهادمان کرد لە دەرەجەی نیهایە
ڕووتێکردنی خوامان دانا بە پشت تێکردنی دنیایە
قەسەم بە قەسەمێ کە وەڵڵاهوبیللایە
هەر کەسێ چاوی لە دنیا نەنووقێنێ، چاوی لای خوا هەڵنایە
ئەگەر...
هەزار تەئویلم لە لایە
ئەم عیلمە عیلمی حاڵە
عیلمی... قەترە بەدەریایە
کەسێ کەسە حەرفێکی بەسە
کەسێ ئەوەندەی بەس نەبێ
هەر تالیبی هەوا و هەوەسە
ئەم عیلمە عیلمی قەسەسە
..........................________________
..........................________________

کاکە ڕێبوار تۆفیق

دوای سڵاو و ڕێزم هیوادارم هەمیشە سەرکەوتوو بیت،
بەگشتی کارەکەتم دەربارەی هەقە خوێندەوە، کارێکی ڕێکوپێک
دیارە و لەو بوارەدا هێشتا پێویستیمان بە خامەی دڵسۆزانە،
ئێستاش لە یادمە چۆن لە منداڵیمدا ئافرەتێکی بە ئەندازە
خاوێن و دڵسۆز بە ناوی پوورە فاتمە کاری لەماڵمان دەکرد، بۆ
خۆی خەڵکی سوورداش بوو، ئێمە تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد هەر
پێمان دەگوت (نەنە)، هەقەیەکی خاوێن و دڵسۆز بوو، هیوادارم
لە توێژینەوەی هەقەکانی کوردستاندا هەمیشە سەرکەوتوو بیت!
سڵاو و ڕێزم دووبارە دەکەمەوە.

کەمال مەزهەر
هەولێر
٢٠١٠/٤/١٨

# ئەنجام

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، دەتوانین ئەنجامەکان، لە ئەم چەند خاڵەدا، کۆبکەینەوە:

١. هەر نووسینێك تاکو ئێستا لە سەر هەقەکان نووسرابێت، ئەو ڕاستییەی نەشاردووەتەوە کە نەیتوانیوە ڕۆشنایی بخاتە سەر هەموو لایەنەکانی کۆمەڵی هەقە و تێیدا داواکراوە کە زۆرتری لە سەر بنووسرێت، ئەوەی لە ئەم لێکۆڵینەوەیەشدا هاتووە، هەمان ڕاستی دووبارە دەکاتەوە و پێی وایە هەموو لایەنەکانی ڕۆشن نەکردووەتەوە.

٢. زنجیرەی تەریقەت لە مەولانا خالیدی نەقشبەندییەوە تا شێخ عەبدولکەریم، بە حەوت کەسدا تێپەڕیوە، کە پەیوەندی کوڕ و باوك، یان خزمایەتی، لە نێوان زۆربەیاندا هەبووە.

٣. ڕێبازی هەقە بە تەنها دەرئەنجامی تێڕوانینی بیری شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە نەبووە، بەڵکو دەرەنجامی ئاسۆی گۆڕانکاری: ئایینی، کۆمەڵایەتی، ئابووریی و نەتەوەیی ئەو ڕۆژگارەشی تێکەڵاو بووە و هەر ئەمەش بووە بە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵی هەقە، ڕێباز و ڕێچکەی جیاوازی هەبێت.

٤. شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ڕێبازی هەقەیە. لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمدا، کۆمەڵی هەقە بە پێی دەستوورێکی جێگیر و نووسراو، بەڕێوە نەڕۆیشتووە.

٥. سنووری دانیشتوانی هەقە، بەشێوەیەکی گشتی کەوتووەتە ناوچەکانی دەورووپشتی دەریاچەی دوکانەوە و بە چڕی بە پارێزگای سلێمانیدا بڵاوبوونەتەوە، هەروەها لە سەنتەری هەردوو پارێزگای کەرکووک و هەولێر و چەند ناوچەیەکی زۆر کەمی ئەم دوو پارێزگایەشدا، نیشتەجێ بوون.

٦. حەمەسووری کڵاوقوت لە دوای کۆچی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەوە، لەگەڵ مامەڕەزادا لە سەر شوێنگرتنەوەی شێخ، ناکۆکی لە نێوانیاندا پەیدا دەبێت و شەدەڵە بەجێ دەهێڵێت.

٧. هەقپەروەریی وەك بنەمایەکی ڕێبازەکە لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمدا، زۆرتر لە لایەنی ئاینییەوە ڕەنگی دابوویەوە و لە سەردەمی مامەڕەزادا، تێکەڵاوی باری کۆمەڵایەتی بووە و بە ناوی (ڕەوشت)ـەوە سنووری بۆ دیاری کراوە.

٨. کۆمەڵی هەقە هەر لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمەوە، وەك کۆمەڵێکی داخراو مامەڵەیان لەگەڵ چواردەوریاندا کردووە و زۆر بە کەمی تێکەڵاوییان لەگەڵ کەسانی دەرەوەی خۆیاندا کردووە. لە سەردەمی مامەڕەزاشدا بەهەمان شێوە، نهێنی ڕاگرتن و خۆگرتنەوە لە هەندێ باسکردن، نەك هەر بەردەوام بووە، بەڵکو وەك ڕەوشت مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، بەڵام لای حەمەسوورییەکان، ئەگەرچی وەك کۆمەڵ کەمتر چوونەتە ناو خەڵکییەوە، بەڵام لە زۆر بابەتدا، کراوەتر بوون.

٩. دروستکردنی پەیوەندی نێوان مامەڕەزایی و شیوعییەکان بۆ داڵدەدانی شیوعییەکان دەگەڕێتەوە لە لایەن مامەڕەزاوە، کە لە ئەنجامدا،

ژمارەیەکی زۆر لە مامەڕەزاییەکان، پەیوەندییان بە ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعیەوە کردووە.

١٠. یەکێك لە ئەو تایبەتمەندییانەی کە بەشێك لە حەمەسوورییەکان هەیان بووە، ئەوەبووە کە نەیان هێشتووە منداڵیان ببێت. ئەم ویستی منداڵ نەبوونەشیان، بۆ مەیلی پیاوەکانیان دەگەڕێتەوە و ژنەکانیان هیچ ئاگاییەکیان لە سەری نەبووە. سەبارەت بە چۆنێتی ڕێگرییکردن لە منداڵ بوون، ڕێگەی بەستنی سروشتی (منع طبیعی)یان گرتووەتە بەر.

١١. خاڵی سەرەکی جیاکەرەوە لە نێوان مامەڕەزا و حەمەسووری کلاوقوتدا بۆ ئەو گرنگی دانە زۆرەی حەمەسوور دەگەڕێتەوە کە بە ژیانی ئابووریی و پێکەوەکارکردنی بە گرووپ داویێتی لەسەر بنەمای "هاوبەشێتی".

١٢. لە ساڵی ١٩٢٤ کە شێخ عەبدولکەریم دەستگیرکرا، ڕێبازی هەقە بەتەواوی گەشەی کردبوو، گرتنەکەشی هەر بۆ ئەوەبووە کە نەهێڵرێت ڕێبازەکە لە ئەوە زۆرتر، بڵاوببێتەوە و فراوان ببێت.

١٣. لە هەرسێ لایەنی ئایینیی و سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە، بەرەنگاری هەقەکان بوونەتەوە و بە بەرنامە دژایەتیی کراون. لە لایەك بە داردەستی ئینگلیز و لە لایەکی ترەوە، بە داردەستی کۆمۆنیستیان زانیون.

١٤. ئەگەرچی خاڵی هاوبەشی زۆر لە نێوان ئەهلی هەق و هەقەکاندا هەیە، بەڵام ناکاتە ئەوەی هەقەکان بە درێژکراوە، یان زیندووکەرەوەی ئەهلی هەق بزانین.

١٥. بەهائییەکان دوور و نزیك کاریگەرییان لە سەر پەیدابوونی ڕێبازی هەقە نییە و ئەوەی هەبووە، تەنها لێکچواندنی ناوەڕۆکی پەیامەکەیانە و هیچ پردێك بۆ گەیشتن و کاریگەری بەهائییەکان لە سەر هەقەکان لە ئارادا، نییە.

# ڕاسپاردە

هەرچەند ئەم بابەتە بۆ ئەوە دەشێت کە پێشنیاز و ڕاسپاردەی زۆری لەسەر بنووسرێت، بەڵام ناچارین لە ئێرەدا و لە چوارچێوەی ئەم "کات و شوێن"دا تەنها ئەم چەند خاڵەی لەسەر بنووسین:

١- وەك بابەتێك لە پرۆگرامی خوێندندا دابنرێت و لە زانکۆ و پەیمانگاکاندا وەك بابەتێك لە هەر بوارێکی: مێژوو، ئایین، کۆمەڵایەتی، ئابووریيدا بێت، لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت. بەتایبەت بۆ خوێندکارانەی خەڵکی ئەو ناوچانەن کە کۆمەڵەکەی تێدا بووە.

٢- لایەنی بەرپرس لە شوێنی تایبەتیدا، هێمایەك یان شوێنێك بۆ ڕێزلێنان لە ئەم کۆمەڵەیە دروست بکات.

٣- بایەخی زۆرتر بەو شوێنە پیرۆزانە بدرێت کە تایبەتن بەم کۆمەڵەیە، بە تایبەت گۆڕی "حەسوور" کە ڕەنگە پاش ماوەیەکی تر، وون ببێت و نەناسرێتەوە.

٤- ئەم بابەتە، بکرێتە کەرەستەی چەند فیلم یان تێکستێکی ئەدەبیی و هونەری.

٥- ئەو کەسانەی کە ماونەتەوە و شارەزاییان لە سەر ئەم بیروباوەڕە هەیە، بەسەر بکرێنەوە و قسە و وێنەکانیان ئەرشیف بکرێت.

# ملخص البحث


تمتلك جماعة (حەقە) تراثاً واسعاً ومتنوعاً في الثقافة الكورديه. فتراثها يعطى نموذجاً لزمن استطاعت فيه ان تؤدي الى التغيير واستحداث مفاهيم جديدة لم تكن معروفة في السابق، كرؤيتها الى: العدالة والمساواة بين الرجل والمرأة والاخوة والاقتصاد المشترك (الملكية المشتركة و العمل المشترك) والتعاون و... بهذه المفاهيم كان أتباع هذه الطريقة ينظمون حياتهم.

تطرق هذا البحث الى جميع الكتابات التي كتبت عن جماعة حەقە وحاول تحقيق وتنقيح ارائهم، واضاف عدد من المحادثات والرسائل والزيارات الميدانية التي سلطت الضوء على الجوانب الغامضة مابين ١٩٢٠- ١٩٨٦، وهذه الفترة هي فترة ظهور هذه الجماعة وخمودها.

بأختصار نستطيع ان نلخص النتائج التي وصل اليها هذا البحث في النقاط التالية:

١- عجز الكُتاب في كتاباتهم التي كتبوها عن جماعة (حەقە)، عن اظهار الجوانب الغامضة في حياة هذه الجماعة. وفي هذا البحث ايضا لا يمكننا ان ندعي باننا امتلكنا كامل الحقيقة عن هذه الجماعة، كما لم يستطع البحث تغطية جميع الجوانب التي تخص جماعة (حەقە) كما يجب.

٢- يفصل سبعة اشخاص آخرين تربطهم علاقة الاب مع الابن او صلة القرابة بين اكثريتهم، مابين الشيخ خالد النقشبندي وصولا الى الشيخ عبدالكريم.

٣- لم تكن ظهور جماعة (حەقە) من نتاج فكر و رؤية (الشيخ عبدالكريم شەدەلە) فقط، وانما كانت نتيجة التغيرات: الدينية، الاجتماعية، الاقتصادية و القومية التي

شهدتها تلك الفترة بصورة مجتمعة، وهذا ماجعل جماعة (حەقە) ذو نهج وطريقة مميزة.

٤- المؤسس الحقيقي لجماعة (حەقە) هو الشيخ عبدالكريم شەدەلە، ولم تمتلك جماعة (حەقە) في عهده دستوراً مكتوباً أو ثابتاً.

٥- كانت حدود مناطق اسكان واقامة جماعة (حەقە) بكثافة في المناطق المحيطة ببحيرة دوكان وغيرها من المناطق التابعة لمحافظة السليمانية وكذلك في مركز محافظتي كركوك واربيل والعديد من القرى القليلة التابعة لهاتين المحافظتين.

٦- بعد رحيل الشيخ عبدالكريم حدثت منافسة على منصب المشيخة بين (حەمە سوور كلاوقوت) و (مامە رەزا) وكان هذا هو السبب الرئيسي لترك (حەمەسوور) منطقة شەدەلە.

٧- مسألة التعظيم وتقديس الحق (هەقپەروەریی) عند الجماعة تعتبر مبدأ أساسياً للطريقة، فانعكست بصورة كبيرة على الناحية الدينية في زمن الشيخ عبدالكريم، وظهرت هذه المسالة في زمن (مامە رەزا) ايضا واختلطت مع الحالة الاجتماعية عند جماعة (حەقە) وسميت بـ(رەوشت- الأخلاق).

٨- تعاملت جماعة (حەقە) كمجموعة منغلقة على نفسها منذ عهد الشيخ عبدالكريم شەدەلە، وكان انفتاحها على جيرانها والمجتمع الخارجي قليلاً جداً، واستمروا في زمن (مامە رەزا) على نفس النهج ولم يتحدثوا مع احد عن انفسهم، واعتبروا ذلك جزءا اساسيا من (رەوشت- الأخلاق) المتبع عندهم، في فترة (حمەسووریین)، وان كانوا منغلقين أيضا لكن اكثر انفتاحا من جماعة (مامە رەزا) في بعض المسائل.

٩- وجود علاقة بين جماعة (مامە رەزا) والشيوعيين، كان سببها احتضان الشيوعيين من قبل الجماعة، مما جعل الكثير من جماعة (مامە رەزا) ينضمون الى تنظيمات الحزب الشيوعي.

١٠- من بين الأمور الخاصة في فترة (حمەسووریین) هو عدم رغبة ذكور الجماعة في انجاب الاطفال، وهذا يعود الى كيفية تعامل الرجال مع النساء عند الجماع، بحيث لم تكن النساء مدركات لطريقة (المنع الطبيعي) للانجاب التي كان يتبعها رجالهم.

١١- الخلاف الرئيسي بين (مامەرەزا) و (حەمەسووری كلاوقوت) يرجع الى اعطاء الاهمية عند حمه سوور للحياة الاقتصادية و العمل المشترك عند جماعته، لأنها في تلك الفترة كانت تعيش على أساس (الإشتراكية) في معيشتها.

١٢- عندما اعتقل الشيخ عبدالكريم في ١٩٣٤، كانت طريقة (حەقە) قد تطورت بشكل كامل، وكان السبب الرئيسي لاعتقاله هو منعه نشر طريقته بشكل واسع في المناطق المجاورة لها والحد لأنتشارها.

١٣- تم محاربة انصار الجماعة من الناحية الدينية و السياسية و الاجتماعية بصورة منظمة، فمن ناحية كانوا يتهمونهم بأنهم عملاء وصنيعة الانجليز ومن ناحية اخرى كانوا يعتبرونهم صنيعة الشيوعيين.

١٤- رغم وجود نقاط مشتركة بين (اهل الحق) وجماعة (حەقە)، ولكن هذا لايعطينا الحق بأن نعتبر (حەقە) تابعاً لأهل الحق أو استمرارا لهم.

١٥- ليس للبهائيين اي تاثير "لامن قريب أو بعيد" على ظهور جماعة (حەقە)، بل هناك تشابه في نقاط مشتركة بين أجزاء من تراتيلهما، ولم يكن هناك أي رابط أو تأثير للبهائيين على جماعة (حەقە).

# سەرچاوەکان

**یەکەم (بەڵگەنامەکان):**


١.بەرنامەی دیرۆك لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان– کەناڵی کەرکووك، ساڵی ٢٠٠٧، ئامادەکردنی سمکۆ بەهرۆز.

٢.چەند چاوپێکەوتنێکی ڤیدیۆیی کە لە ساڵی ١٩٨٦دا لە لایەن (عەباس عەبدولڕەزاق– عەباسی ڤیدیۆ)وە وێنە گیراون.

٣. ناسنامەی باری شارستانیی (حەمەسووری کڵاوقوت)

٤.نامەیەکی شێخ ئەحمەدی سەردار بۆ مەولانا خالیدی نەقشبەندیی.

٥.نامەیەکی مەولاناخالیدی نەقشبەندیی بۆ شێخ ئەحمەدی سەردار.


**دووەم (کتێب):**

**أ/ کتێبی کوردی:**


٦. ئاغا و شێخ و دەوڵەت، مارتین ڤان برونەسن، وەرگێڕانی: د.کوردۆ عەلی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٧. ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە، مستەفا عەسکەری، چ٢، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.

٨. ئاین و باوەڕ لە کوردستاندا، کەریم زەند، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٧١.

٩. ئاین و تایفە ئاینی یەکان لە کوردستان، میهرداد ئیزەدی، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: کامەران فەهمی، بڵاوکراوەی: مەکتەبی بیرو هۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٢.

١٠. ئایینستان، کەریم زەند، چ١، چاپخانەی ئەزمڕ، سلێمانی، ٢٠٠٦.

١١. ئیدارەی کوردی ئاستەنگ و ئاسۆی گەشەکردن، مامۆستا جەعفەر، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك) دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٩.

١٢. بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە، رؤوف محمد زهدی، چاپخانەی الحوادث، بەغداد، ١٩٨٥.

١٣. بنچینەکانی کورد و چەند وتارێکی کوردناسی، ڤلادمێر مینۆرسکی، وەرگێرانی: د. نەجاتی عەبدوڵڵا، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧.

١٤. تەسەوف چی یە، ئەمین شێخ علادین نەقشبەندی، چ١، دار الحرية للطباعة، بەغداد، ١٩٨٥.

١٥. ژیانی ئافرەتی کورد، هێنی هارۆلد هانسن، وەرگێرانی لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ کوردی: عەزیز گەردی، چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٣.

١٦. راپەرینی عەلەویەکانی زاگرۆس یا لێکۆڵینەیەکی مێژوویی لە سەر ئەهلی حەق، محەمەد عەلی سوڵتانی، وەرگێرانی لە فارسییەوە: حەسەن عەبدولکەریم و کەمال رەشید، سلێمانی، ٢٠٠٣.

١٧. رەوشی ئاینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، رەشاد میران، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری برایەتی، هەولێر، ٢٠٠٠.

١٨. سۆفی و سۆفی گەرێتی..، لەتیف هەڵمەت، بڵاوکراوەی پاشکۆی رەخنەی چاودێر، سلێمانی، ٢٠٠٩.

١٩. سۆفیگەری، د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، چ١، دەزگای موکریان، هەولێر، ٢٠٠١.

٢٠. سلێمانی زەمینەی پەرەسەندن و ململانێی تەسەوف، عەتا قەرەداغی، زنجیرەی بڵاوکراوەکانی هەفتەنامەی سلێمانی نوێ، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٢١. شێخ رەزای تاڵەبانی، د.مکرم تاڵەبانی، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

٢٢. چەند باسێك دەربارەی ئەهلی هەق، هـ. ئاجەریان، ف.مینۆرسکی، د. محەمەد موکری، ژ.هـ.کرامیرز، وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: نەجاتی عەبدوڵڵا، هەولێر، ٢٠٠٥.

٢٣. کاکەیی، محەمەد ئەمین هەورامانی، چاپخانەی (الحوادث) بەغدا، ١٩٨٤.

٢٤. کۆمەڵناسی کوردەواری، د.حوسێنی خەلیقی، بەرگی دووەم، چاپخانەی الحوادث، بەغداد، ١٩٩٢.

٢٥. کورد. تورك. عەرەب، سیسیل جۆن ئیدمۆندس، وەرگێڕانی: حامید گەوهەری، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.

٢٦. کچانی کورد، هێنی هەرۆلد هەنسن، وەرگێڕانی: ناجی عەبباس ئەحمەد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغداد، ١٩٨٠.

٢٧. یادی مەردان، بەرگی یەکەم، مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٩.

**ب/ کتێبی عەرەبی:**

٢٨. الأديان و المذاهب بالعراق، رشيد الخيون، منشورات الجمل، الطبعة الثانية، ٢٠٠٧.

٢٩. بهاءالله و العصر الجديد مقدمة لدراسة الدين البهائي، د. جون اسلمنت، الطبعة الأولى، مؤسسة النشر البهائية، ١٩٧٠.

٣٠. تاريخ السليمانية و انحائها، محمد امين زكي، ترجمة: محمد جميل روز بياني، طبع شركة النشر و الطباعة العراقية المحدودة، بغداد، ١٩٥١.

٣١. تاريخ الفلسفة في الاسلام، دي بور، ترجمة: مجمد عبدالهادي ابو زيدة، ط٥، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨١.

٥٤. یاداشت نامەی ژیانم، جەمال بابان، چ١، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٧.

**شەشەم (گۆڤار):**

٥٥. تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ ئەحمەدی سەرداری سەرگەڵوییەوە بەرەو حەقە، عارف تەیفوور، گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٦٩، ساڵی ٢٠٠٢.

٥٦. تێڕوانینێک بۆ ڕابردووی هەشتا ساڵەی گرووپی هەقە، لێکۆڵینەوەی: عەبدولکەریم مەحموود، گۆڤاری تایم، ژمارە ١١، ساڵی ١٩٩٩.

٥٧. حەمەسووری کلاوقوت و بزوتنەوەی حەقە، فریاد شوانی، گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٢٣، ساڵی ٢٠٠٦.

٥٨. حركة حقة والحمسورية والاسلام الباطنية، رفيق مجيد عبدالله: مجله جامعه دهوك، مجلد ٢، ١٩٩٩، عدد ١.

٥٩. دیدارێك لەگەڵ ڕابەری بزوتنەوەی هەقەدا، گۆڤاری لڤین، ژمارە ٨٦، ساڵی ٢٠٠٩.

٦٠. ڕیشەو پێشینەی ڕێبازی نەقشبەندی لە کوردستاندا، د. هەڵکەوت مەلا حەکیم خانەقینی، گۆڤاری سەنتەری ستراتیجی (سیاسەتی دەولی) ژمارە ٢١، ساڵی شەشەم ١٩٩٨.

٦١. کاکە حەمەی کلاوقوت و هەندێ سەرنج و بیرەوەری، د. عەبدولستار تاهیر شەریف، گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٢٤، ساڵی ٢٠٠٧.

٦٢. کەسایەتی مەلا مستەفا، دەست نووسی: هەمزە عەبدوڵلا، گۆڤاری k٢١، ژمارە ٢ – ٣، ٢٠٠٨.

٦٣. کەڵچەری ئەهلی هەقە، ئا:موعتەسەم ساڵەیی، گۆڤاری مێرگ، ژمارە ٥٠، ٢٠٠٩.

٦٤. کورتە باسێك حەمەسووری گوندی کلاوقوت، بەهجەت محەمەد- شاهۆ، گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٢٩، ساڵی ٢٠٠٦.

٦٥. لەبارەی ڕێبازەکانی سۆفیزم لە کوردستاندا، د.جەعفەر عەلی، گۆڤاری کوردۆلۆجی، ژمارە ١، ساڵی ٢٠٠٨.

٦٦.مەسەلەیەکی مەزن و هەوڵێکی کەم، رشید محمد علي، گۆڤاری کاروان، ژمارە ١٥، ساڵی ١٩٨٣.

٦٧.مولانا خالد النقشبندي، عباس العزاوي، مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد ١، بغداد، ١٩٧٣.

**حەوتەم (ڕۆژنامە):**

**أ/ ڕۆژنامەی کوردی:**

٦٨.ڕۆژنامەی العراق، وتارێکی جەمال بابان، ژمارە ٢٣٣٤، ١٩٨٣/١٠/٥.

٦٩.کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ژمارە ١ی ساڵی ١٩٨٣.

٧٠. کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ژمارە ٣ی ساڵی ١٩٨٣.

٧١. کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ژمارە ٧ی ساڵی ١٩٨٣.

**ب/ ڕۆژنامەی عەرەبی:**

٧٢. جريدة (الجمهورية) يوم الخميس، ايلول ١٩٥٨.

**هەشتەم (دەستنووس):**

٧٣.بەختیار حەسەن کەریم: ژیاننامەی حەمەسووری باپیرم، ٢٠٠٩.

٧٤. نامەیەکی (جەلال دەباغ) بۆ لێکۆڵەر لە ٢٠٠٩/٧/١٧دا

٧٥.نامەیەکی (ڕەشید محەممەد عەلی) بۆ لێکۆڵەر لە ٢٠٠٩/١١/٢٥دا.

٧٦.نامەیەکی (عومەر عەلی سەعید موتابچی) بۆ لێکۆڵەر لە ١/١٢/٢٠٠٩دا.

٧٧.د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێك، ٢٥/٥/ ١٩٩٥.

٧٨. د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێك، ٢٠٠٧.

**نۆیەم (چاوپێکەوتن):**

٧٩. چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ مامۆستا (ڕەشید محەممەد عەلی) ڕۆژی٣٠/١١/٢٠٠٨، سلێمانی.

٨٠. چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (سەوزە عەبدوڵڵا محەممەد ئەمین) ڕۆژی ١٧/١٢/٢٠٠٨، سلێمانی.

٨١. چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (شێخ عومەری کاکە حەمەی مامەڕەزا) ڕۆژی ٢١/١١/٢٠٠٨، سلێمانی.

٨٢. چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (مەحموود حاجی ئەحمەد بابەکر شەشۆیی) ڕۆژی ١٨/١/٢٠٠٩، سلێمانی.

٨٣. چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (مەلیحە فەتحوڵڵا سەعید) ڕۆژی ١٢/٤/٢٠٠٩، سلێمانی.

٨٤. چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (کەریم زەند) ڕۆژی ١٤/١١/٢٠٠٨، سلێمانی.

٨٥. چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (جەمال بابان) ڕۆژی ٥/١/٢٠٠٩، سلێمانی.

٨٦. چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (تەلحە سەید حەمیدی دەلۆیی) ڕۆژی ٢/٩/٢٠٠٩، کەرکووك.

٨٧. چاوپێکەوتنی لێکۆڵەر لەگەڵ (عەبدوڵڵا محەممەد شەریف) ڕۆژی ٣٠/١١/٢٠٠٨، سلێمانی.

**دەیەم (ئینتەرنێت):**

٨٨. www.Burhaniya.org

# ئیندێکس*

## ( ئیندێکسی ناو )

### ئـ



---

*- لە ئەم ئیندێکسەدا، ناوی نووسەر و شوێنی چاپکردنی بەرهەم تۆمار نەکراوە.

# ب



# ت



# ج

# ح

# خ



# د



# ڕ

# س

## ش

## گ



## ع

# غ



# ف



# ق



# ك

## ل



## م

# ( ئیندێکسی شوێن )

## ئـ



## ب

## ت



## پ



## ح



## خ

## د



## ڕ



## س

## ش



## چ

## گ



## ع



## ق

## ك



## م

## ن



## ه



## ی

14. Her çend aliyên hevbeş ên Ehl-î Heq û Heqan gelek in, lê nabe em Heqan wekî peyajo an zîndîkarê Ehl-î Heqan bizanin.
15. Behayiyan ji dûr an nêzîk ve kar di rabûna Koma Heqan nekiriye; ya ku li dar e bi tenê lihevşibandina naveroka beyannameya wan e, jê pê ve tu sedem û nîşane ne li kar in di warê karîgeriya Behayiyan li ser Heqan.

têkilî bi kesên derveyî xwe re daniye. Di serdema Mame Reza de jî bi heman awayî, sir û nihênî veşartin, xwe dûr girtin ji behskirina hin mijaran, ne ku her berdewam kiriye, tew wekî rewişt serederî digel hatiye kirin, lê tagirên Heme Sûr, her çend wek kom kêmtir ketine nav xelkê, lê di gelek mijaran de vekirîtir bûne.

9. Ji ber wê çendê ku Mame Reza Komûnîst hewandine, ew wekî dilxwazê komûnîstan hatiye danîn û di dawiyê de gelek ji tagirên Mame Reza têkilî bi rêxistinên Partiya Komûnîst re daniye.

10. Yek ji taybetmendiyên Heme Sûriyan jî ew e ku nehiştine zarokên wan bibin ku haya jinên wan ji vê çendê nebûye. Wan ji bo zarokên wan nebin riya"girêdana sirûştî (bestinî sirûştî) " bi kar anîye.

11. Xala serekî ku rêbaza Mame Reza û Hemesûrê Kilawqut ji hev cuda dike ew e ku Hemesûr bêhtir pûte bi jiyana aborî û pêkvekarkirinê daye ku li ser bingeha "tevkariyê" daniye.

12. Di sala 1934ê de ku Şêx Ebdulkerîm hate girtin, Koma Heqan bi yekcarî xurt bûbû; girtina wî jî ji ber hindê bû ku pêşî li komê bê girtin da ku bêhtir belav û berfireh nebe.

13. Di warê ayînî û siyasî û civakî de pêşî li Heqan hatiye girtin û bi bernamesazî dijberiya wan hatiye kirin. Ji aliyekî ve wekî dardestê îngilîzan û ji aliyekî ve wekî dardestê komûnîstan hatine zanîn.

Bi kurtî em dikarin puxteya encamnameya vê lêkolînê di van çend xalên xwarê de kom bikin:

1. Her nivîseke ku heta niha li ser Heqan hatiye nivîsîn wê rastiyê venaşêre ku neşiyaye ronahiyê bide ser tevahiya aliyên Koma Heqan û tê de hatiye xwestin ku bêhtir li ser wê bê nivîsîn. Ev yek di vê lêkolînê de jî derket holê û di wê baweriyê de ye ku ronahî nedaye ser tevahiya aliyên vê komê.

2. Zincîreya komê ji Mewlana Xalid Neqşîbendî heta Şêx Ebdulkerîm digihêje 7 kesan ku pêwendiya kur û bav yan merivtiyê di navbera piraniya wan de hebûye.

3. Koma Heqan bi tenê derencama nêrîn û ramana Şêx Ebdulkerîmê Şedele nebûye, jê bêhtir guherînên dînî, civakî, aborî û neteweyî yên wê serdemê jî kar tê kirine û her vê yekê kiriye ku Koma Heqan rê û rêzeke cuda hebe.

4. Şêx Ebdulkerîmê Şedele damezrînerê rastîn yê Koma Heqan e, lê di serdema Şêx Ebdulkerîm de kom li gorî rêz û destûreke binecî û nivîskî bi rê ve neçûye.

5. Peyajo û dilxwazên Heqan bi giştî li hawîrdora Gola Dukanê, bi pirî li parêzgeha Silêmaniyê belav bûne. Her weha li navenda parêzgeha Kerkûk û Hewlêrê û çend deverên wan jî peyajo û dilxwazên komê hene.

6. Piştî mirina Şêx Ebdulkerîmê Şedele li ser wê yekê ku dê kî şûna wî bigire nakokî di navbera Heme Sûrê Kilawqut û Mame Reza de peyda dibe, lewra Heme Sûrê Qilawqut, Şedele li cî dihêle.

7. Heqperweriyê wekî prensîbeke komê di serdema Şêx Ebdulkerîm de bêhtir ji aliyê dînî ve reng vedaye û di serdema Mame Reza de têkilî rewşa civakî bûye û bi navê "rewişt" sînor jê re hatiye diyarkirin.

8. Koma Heqan her ji serdema Şêx Ebdulkerîm ve wekî komeke girtî bi derdora xwe re serederî kiriye û gelek kêm

# KURTEYEK LI SER KOMA* HEQAN Û PIRTÛKÊ

Koma Heqan, xwediyê samaneke dewlemend ya piralî ya ferhengî ya kurdî ye, ji ber ku tomara kelepûrê Heqan nimûneya serdemeke nîşan dide ku şiyaye guherîn û çend rewişt û tîtalên nû di civakê de pêk bîne ku beriya wê nimûneyên wê tunebûne. Her wekî nêrîna wan ya li beranberî wekheviyê, biratî û dadperweriyê, jinan û aboriya hevpişk, kase û karê hevpişk û alîkarî û xêrxwaziyê ku serkaniya her yek ji van nêrînan ku Heqan jiyana xwe pê saz kiriye, ji kom û tevgerên wê serdemê zaye.

Di vê lêkolînê de kar li ser tevahiya wan nivîsan hatiye kirin ku heta niha li ser Heqan hatine nivîsîn û li gorî karîn û zanînê, hin agahî û mijarên ciyê dudiliyê hatine peyitandin û dîtinên nû li ser hatine xuyakirin. Her weha komek hevpeyvîn û name û serdanên meydanî jî bûne haveynê vê xebatê û ronahî dane ser aliyên veşarî yên navbera salên 1920-1986an ku serdema rabûn û lawazketina rêbazên cuda ya vê komê ye.

---

* *Her çend Koma Heqan (Komelî Heqe) ji nav Terîqeta Neqişbendiyan rabûye, lê bi rabûn û rûniştin û kar û xebata xwe bi yekcarî li terîqetan naçe, lewra me peyva kom bi kar anî da ku aliyê wan yên civakî û siyasî jî bide xuyakirin. Li aliyê dî me peyva "bizav-tevger" bi kar neanî çima ku wan jî kiraseki siyasî wergirtiye.*

